پرۆژەی خوێندنەوە بۆ هەموان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار «١٥٠»



# نامە نووریەکان



بەرگی یەکەم

عادل شێخانی



ناوی کتێب: نامە نوورینەکان بەرگی یەکەم
نووسینی: عادل محمد شێخانی
دیزاین: گۆڤاری بڕیار
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ساڵی چاپ: ٢٠١٨
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٢٥٣) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە

دەزگای بڕیار بۆ چاپ و پەخش و بڵاوکردنەوە
مؤسسة بريار للطباعة والنشر والتوزيع

# نامە نوورینەکان

**نامە نوورینەکان** .. ملوانکەیەکن لە زیو، مانگانە پەیامێکن بۆ ئازیزترین کەس، چرپەیەکن بۆ ڕۆحە پاکەکان!

نیگایەکن بۆ ڕووخسارە نورینەکان!

شەونمێکن لە موناجاتی سەحەر، ئەسرینێکن بۆ گوڵاوپرژێنی دڵ!

لەگەڵیدا دەچینە نێو دەریای سەکینەی ئیلاهیو پروشەی بارانی میهری خودایی!

ئاوێتەبوونە بە ئەوینی پاكو لەزەتی عبودییەت.

پشوویەکە بۆ ڕۆح، هەوارێکە بۆ حەسانەوە لە شەکەتیومەینەتی، ئەم ڕۆژگارە!

ژیانە لەگەڵ پەروەردەی پەروەردگارو باوەڕ بە مەعبودی گەورەو شەیدابوونە بە ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای زاتی ئیلاهی!

**نامە نوورینەکان** وتەی دڵە بۆ دڵو چرپەی ڕۆحە بۆ ڕۆح، ساتەکانی ژیان لەگەڵیدا، خۆشترینو بەهادارترین، ساتەکانی تەمەنتانن..

بە هیوای نزای خێری ئێوەین..

دەزانم بەرەنگاربوونەوەی شـــاوەت و ئارەزووەکان کارێکی زەحمەتە بۆ کەســێك کە نەیتوانیبێ جڵەوگیری نەفســی خۆی بکات و لەپێناو خۆشەویستی خودادا هەموو جۆرە قوربانییەك بدات!

ئازیزەکەم، ڕۆچوون لە بەهەشــتی خۆشەویســتی خودادا وادەکات مرۆڤ لە ململانێ لەگەڵ حەزوئارەزووەکانی دونیادا هەســت بەتام و چێژێك بکات، کە هەرگیز لە گوێڕایەڵی نەفســی ئەممارەو گەیشــتن بەباق و بریقی سەراب ئاسای حەزوئارەزووەکاندا بەدیناکات!

ئەمن، تا لە خۆشەویستی خودا تێنەگەیشتم نەمدەزانی حەقیقەتی خۆشەویســتی هەرچییــە! هەرچەنــدەم خوێنــدەوەو هەرچەنــدی گــەڕام لەدواییــدا زانیم خەڵکی خەریکی چیــن و چۆن دەڕواننە خۆشەویســتی و حەقیقەتــی ئەو ناوەبەرزەش لــە کوێدا بەدی دەکرێت! ئەو کات زانیم ئەوەی خودای خۆشــنەوێت، باوەڕناکەم هەرگیز بتوانێت بەتەواوی مانا، کەسی خۆشبوێت!

هەمیشــە ئــەو چیرۆکەم لەیــادە کە مامۆســتاکەم بۆ پێناســەی ((خۆشەویستی سادەو بێ مانا)) بۆی گێڕاینەوە.

مامۆســتا دەیگوت: جارێك قوتابییەك لە مامۆســتاکەی دەپرسێت: مامۆستا خۆشەویستی چییە!؟

ئەویش دەڵێت: بچۆ لە گوڵزاری قوتابخانەکەدا جوانترین گوڵم بۆ بێنە، ئەویش ڕۆیشت و پاش ماوەیەك بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە!

مامۆستا لێی پرسی بۆچی بەدەستی خاڵی گەڕایتەوە؟

گوتی: مامۆستا سەرەتا گوڵێکی زۆر جوانم بەدیکرد، گوتم بابچم

بزانــم گوڵێکی جوانترم دەســتناکەوێت، تا من بەنێو گوڵزارەکەدا گوزەرمکردو گەڕامەوە بۆلای گوڵی یەکەم، تەماشادەکەم نەمابوو!!

کەواتــە زۆربــەی مرۆڤــەکان بەئومێــدی جوانتــرو قەشــەنگتر هەڵبەت لە ڕووکەشــدا، بەدووی خۆشەویســتی نوێدا دەگەڕێن، کاتێك خۆشەویستی ڕاستەقینەیان دەدۆزنەوەو دەگەڕێنەوە بۆلای دەبینن، کە ئەو ماڵئاوایی لێکردون!!

وەلــێ مرۆڤە ژیرەکان وێڵ و ســەرگەردانی ســیماو ڕوکەشــنین و دەزانن چییان خۆشــدەوێتو کێیان خۆشدەوێت، لە دنیاشدا خوداوەند ڕووخســاری بێ وێنەی خۆی لە خۆشەویستان شاردۆتەوە، تا بەچاوی دڵ تەماشای بکەنو بەتاسەو شەوقێکەوە شەیدایبن، کە تا ڕۆژی دیدار ئەو تاسەیە نەشکێت!!

بۆیــە کاتێك دەچینــە نێو کۆڕی یادی خوداو ســەرێك دەدەین لە ژووانی خۆشەویســتی خواویستان و ڕێبوارانی ڕێگای بەهەشت، ئەوسا ســەدای گریــان و خــوڕەی فرمێســك و ناڵەی نەی ئاســا لــە دالانی موحیببەتدا دەنگدەداتەوە!

گــەرتــۆ ڕازی بــی و دونــیــام ئــەشکــەنجــە
خــوێــنــم خــەنــەبــێ، بــۆ دەســــت و پــەنــجــە
مــــاڵ و ســــــەروەت و ســـەروســامــانــم
پــاکــی بــەفــیــدای، ڕووی تــۆ دەزانــــم
هــەرتــۆ بــە بــەنــدەی خــۆتــم بــزانــی
ئــاوڕ نــادەمـــۆ، بــۆ دونــیــای فــانــی

شەوانە کاتی، دەستلەملانی خەو
دێمە ژووانی، بێدارانی شەو
لەنێو میحرابی ڕازی ئیلاهی
لەسەربەرماڵی ژووانی خودایی
بەسەر ڕوومەتی زەردی خەمنشین
ورد دێنەخوارێ، فرمێسکی ڕەنگین
چرپەیە، ڕازە، دوعاو نزایە
هاواری بەندەی ڕوو لە خودایە
شەوەن، تاریکەن ماڵ بێ ئەغیارەن
عالەم خەفتگەن، دۆست خەوەردارەن*
چ بەهەشتێکە، ئەم جێ ژووانە
کۆڕی گریانی، ئەهلی ئیمانە
گەر بۆ یادی تۆ، دڵ نەیاتەجۆش
دیارە نەماوە، ئەقڵ و فام و هۆش
من تۆ بناسم، کەسم بۆ چییە؟!
باکم بە نازو نیگای کەس چییە؟!
لەدوای سیمای تۆ بڕوانمە بەشەر؟!
خۆمخەمە داوی، ڕێگای پڕ خەتەر؟!
من جگە لە تۆ، دڵ نادەمە کەس
بۆ ڕووی تۆ نەبێ، ڕوو نادەم وەکەس!
پەروەردگارا، غەرقی عیصیانم

کوشتەی گوناهو هەڵەو تاوانم
بمبەخشە ئەوا هاتوومە دەرگات
مەشکێنە دڵی، بەندەی پڕ ئاوات
خۆزگە، دەتزانی خۆشەویستی خوا
وەختێ نەمامی، لەدڵدا ڕووا
ژیان دەبێتە، چ گوڵستانێ
داماوە ئەوەی کەوا نایزانێ
ئەو ڕۆحەی بە خوا ئاشنا نەبووبێ
هەژارە، ئەگەر دنیای هەبووبێ
بێ خۆشەویستی و نووری خودایی
دنیا تاریکەو دیدەش کوێرایی
خێراکە، چرا هەڵکە درەنگە
دڕدە بەتاری، ئەو شەوەزەنگە
ئاودامان جلی سپیت بپۆشە
ئای کۆڕی زیکر، چەند پڕ خرۆشە!
با لە کونجێکی میحرابی ئەوین
بۆ ساتەوەختێ تۆزێ بسرەوین
دوور لە شەیتان و نەفس و ئەم دنیا
با ئاوێتەبین، بەیادی خودا
ئیتر ژینی من ناچێ بێهودا!*
بوین بەڕێبواری ڕێبازی هودا!!

کاتێك گەیشـــتمە کۆتایی نامەکەی، خۆر خەریـــك بوو ئاوا دەبوو، ئاسۆ سور هەلگەڕابوو، وەکو چاوەکانی من ببوونە گۆمی خوێن!

جـاران، گریـــان بۆ من، تەنها خـــەم بوو، ئێســـتا ئۆخژنی دڵمەو خۆشـــترین ســـاتەکانی ژیانم ئەو ســـاتەیە کە فرمێســـکی پەشیمانی هەڵدەوەرێنم، ئێســـتا دەزانم کە ژیان بێ خۆشەویســـتی و فرمێسك و تاســـەو چاوەڕوانی و ســـۆزو میهری خودایی، چ بیابانێکی وشك و بێ ئاوە!؟

ئێســـتا، کە ئەو کۆچی کردووەو ماڵاوایی لەم دنیایە کردووە، بەڵام سیمای پڕنوورو وشـــە جوانەکانی هەمیشە لەبەر دیدی خەیاڵی منن، بـــە ئومێدی دیدار لە بەهەشـــتی کردگارا درێـــژە بەژینی کورتی ئەم دنیایەم دەدەم!

خودایـــە بەڕێبواری ڕێگای بەهەشـــتمان قبوڵ بکەیت و بەســـۆزو میهری خۆت دەســـتی لاوازمان بگریت و لە نووری خۆت مەحروممان نەکەیت!!

* ئیلهامە لە شیعرێکی مەولەوییەوە.

* بێهودە: واتە بێسوود لەبەر کێشی شیعرەکە بووە بە بێهودا.

لــە منداڵیمەوە حــەزم لە بەربــاران دەکرد، ئــەو کاتەی لە قوتابخانــە دەگەڕامەوەو باران پروشــەی دەکــرد، ورد، ورد، ملی ڕێگــەم دەگرت، تا دەگەیشــتمەوە ماڵێ، باران تــەواو ئاوپرژێنی دەکردم!

لەبەربارانداا هەستم بە هێمنیو ئارامییەکی بێ سنوور دەکرد. زۆرجار ئارەزووم دەکرد، منیش وەکو ئاســمان بگریم، خۆ ئەگەر گریان نەبا، من ئێســتا دەمێك بوو، ماڵاواییــم لە ژیان کردبوو. کاتێك خەم گەمارۆم دەدات، هەناسە لە گەرومدا دەتاسێ، خەندە لــە لێوم دەتۆرێ، فرمێســك لە چاومدا قەتیــس دەبێت، ئەگەر نەگریم ســینگم شــەق دەباو دڵم دەبێت بە قەفنەس، هەربۆیە شەریف دەڵێت:

دڵــــم تــەنــگــە پــەرێــشــانــم دەمــێــکــە
خــەیــاڵــم هــــەردەمـــێ لانــــەی خــەمــێــکــە
ئــــەوەنــــدە دڵ پـــــڕم، پــێــمــخــۆشــە بــگــریــم
کــەفــرمــێــســكو هــەنــاســەش مــەرهــەمــێــکــە

ئەمڕۆش تا گەیشــتمەوە ماڵێ، تــەاوی جلەکانم تەڕبوو، قژم هێنــدە تەڕ ببوو، کە باراناو لە نێوەڕاســتی ســەرمەوە بەســەر ڕوومدا دەهاتەخوار، تا دەگەیشتە سەربەرۆکم.

لە پۆلی دووەمی ســەرەتایی بووم، لە ڕۆژێکی ساردی زستاندا، ڕەشــەبا چەترەکەی شــکاندم، ئیتــر لــەو ڕۆژەی ڕا چەترم بە دەستەوە نەگرتو خۆم لە باران نەشاردەوە!

هـەر کـە گەیشـتمەوە ماڵێ، جلـە تەڕەکانم بـە دیوارەکەدا هەڵخسـت، هێندە تەڕببوون، ئاویان لێدەچـۆڕا، بەخێرایی خۆم گۆڕیو چووەمە لای سـۆپاکەو دانیشتمو بە دەسماڵێك دەستم بە وشـككردنەوەی قژم کـرد، بۆنی بارانم لەگـەڵ خۆمدا هێنابوو، هەموو ژوورەکەم بۆنی بارانی گرتبوو، ئای کە بۆنی باران چەند خۆشە!

بـاران چ ڕەمزێکی پاکیو بێگەردییە، لەگـەڵ خوڕەی باراندا هەسـت دەکەیت، بوونـەوەر هەمووی خۆی لـە گوناهەکان پاك دەشواتو سەرلە نوێ پاك دەبێتەوە!

یەکسەر تۆم بە خەیاڵدا هات، زۆرم بیردەکردی، حەزم دەکرد تۆش ئێسـتا دوای ئـەوەی بۆنی باران کەیلو مەسـتی دەکردی، لە بەرامبەرم دانیشـیو گوێت بۆ ڕازو نیازی دوای بارانی سـۆزو میهرەبانی خوداوەند ڕادەگرت!

تـۆ وا دەزانی من هیچ پێویسـتم بە تۆ نییـەو بوونی تۆ بۆ مـن مانایەکی نییە، ئازیزم من لە دەریای میهری تۆدا، بەسـۆزو ئەوینێکـی بـێ وێنە، ئاشـنابووم، تۆ بۆ من وەکـو باران هیواو هێمنـیو ئارامیـت، وەکو گڕی ئاگرەکە دەسـتی نەرمی سـۆزو خۆشەویسـتی بوویت، هەرچەندە ئێسـتا زۆر لێم دووریت، وەلێ هاودەمی هەموو سـاتەکانی ژیانمـی، وێنەت لە هەموو گزنگێکی نوێو سـاماڵی ڕۆژێکـی خۆشو دڵۆپە بارانێکـی، بەخوڕو دێڕی هەموو کتێبەکانی نێو کتێبخانەکەمدایە.

لەگەڵ هەموو نزاکانمدا، کاتێك دەســتی لەرزۆکی بەندایەتیو ملکەچــی بۆ پەروەردگار بڵند دەکەم، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دوعات بۆ دەکەمو، لە پەروەدگار لێخۆشبوونو سەرفرازیت، بۆ بە ئاوات دەخوازم.

شــەوانە لە میحرابی ئەوینی خوداییــدا، کاتێك پەڕاوی ژینی بابردووم هەڵدەدەمەوە، سەری شەرمەزاری دادەخەمو بۆ ڕۆژانێك فرمێســك دەڕێژم، کە دوور لە نــووری خوداو هیدایەتو چرای ئیمان، لە تاریکی بێ ئاگاییدا بەسەرم بردن، بۆ شەوانێك دەگریم کــە دەبــوا لە ژێر باڵی ڕەشــی شــەودا بۆ ئەوینێکــی حەقیقی فرمێسکم ڕشتبا!

بەڵام نوقمی دەریای ڕەشــی بێئاگایی بوومو لە ســۆزو میهری خودایی مەحرووم بووم!

بۆ ڕۆژانێك فرمێســك دەڕێژم کە خۆشم لای خۆم نامۆبوومو لە گێژاوی نەفامیدا سەرم لێشێوابوو!

تۆ چاوەکانت کردمەوە، پێشــتر نەمدەزانی جوانی چییە، ئەو شتانەی کە بەجوانم دەزانی ئێستا دەزانم چەندە ناشیرینە!

من بەدوی سەراب کەوتبووم، تەنها ڕووکەشی شتەکانم دەبینیو زۆر لە حەقیقەتەکان بێئاگابووم!

من هەمیشە بەدوی ئەو بەختەوەرییەدا وێڵبووم، کە تەنها بە وەهمو خەیاڵم دەزانی!

من تەنها کاتەکانی ژیانی خۆم بەفیڕۆ دەداو لە هەموو شتەکان

هەڵدەهاتم، تەنانەت لە خودی خۆشم!

هیوا لە فەرهەنگمدا نەبوو، بڕوام بەوەنەبوو، کەسێك بەڕاستی منی خۆشــبوویێت، یا باشــتر بڵێم، خۆشەویســتیم بە ئەفسانە دەزانــی! چونکــە دەمبینی چۆن ئەو وشــە بــەرزە، وەکو داوێك دەنرێتەوەو مرۆڤە سادەو ساکارەکانیش پێوەی دەبوون!

بە چاوی خۆم دەمبینی چۆن لای زۆربەی کەسانی دەوروبەرم پارەو ســامان تاکە پێوەری پەیوەندی خۆشەویســتی بوو! هەرگیز نەمدەزانی خۆشەویســتی ڕۆحو ئاوێتەبوونی ڕۆحەکان مانــای چییە!! چونکە من تەنها لە جیهانی مادەدا دەژیام!

بە مرۆڤە دەروون پاکە دڵسپییەکان ئاشنا نەبووم، بە ڕێگایەکی تاریکدا بێ نووری چرایەك ڕێگەم دەکوتا!

نەمدەزانی چیدەکەم، بۆ کوێ دەچم؟!

لە پێناوی چیدا دەژیم، لە نێو قەفەزێکی گەورەدا دەژیام.

ئەو پەروەردگارەم نەدەناسی کە خۆشی دەوێم، هەمیشە دەرگای میهرەبانیو ســۆزی خۆی بۆ والاکردووم، چاودێریم دەکات، بانگم دەکات، تــا بــەرەو لوتکەی بەرزی مرۆڤایەتــیو پاکیو بێگەردی هەنگاو بنێم!

تــۆ بۆ من ئەو قوتابخانەیە بوویت، کە جوانترین وانەی تێدا فێربووم!

لەو ڕۆژەوە بە ڕۆحت ئاشنا بووم، هێندە هۆگرت بووم، کە بۆ ساتێك ناتوانم لە یادت بکەم!

با پەیامەنوورینەکانت بەردەوام بێت، با وتە شـــیرینەکانت، کە هەڵقوڵاوی دڵێکی پڕ ســـۆزو ئەوینـــن، بگاتە گوێچکەم، با دوور لە دنیای پڕ جەنجاڵیو ژاوەژاوی مرۆڤەکان ســـاتێك ڕۆحم ئاسـوودە بێت، هەرچەندە ئێستا هۆگری خۆشەویستی خوداو وتە شیرینەکانی پەیامبەری ئازیزم، وەلێ هەندێجار هەست بە غوربەت دەکەم، ئەو مرۆڤانەی کە ئێستا پێیان ئاشنا بووم، زۆر کەمن!

کەمن ئەوانەی وەکو من بیردەکەنەوە!

کەواتە هێشتا من تەنیام، هەر تۆ تەنیانیت، هەمیشە چاوەڕانی نامە نوورینەکانی تۆم!

ئێستا خامەکەم دادەنێم، زۆر بە تاسەوەم بۆ دوو ڕکات نوێژو موناجاتی پەروەدگارم.....

لەوێـــدا ئارامـــی بـــاڵ بەســـەر دەروونمدا دەکێشـــیو هەموو خەمەکانم بیردەچێتەوە، بە چەند دڵۆپە فرمێسکێك دڵم ئۆخژن دەگریو دەچمە نێو دەریایەکی پڕ لە نوور....

دڵنیاشبە هەمیشە لە نزاکانما، لە پەروەردگار بۆ بەختەوەریو سەربەرزیو سەرفرازی تۆ دەپاڕێمەوە!

سەفەر بۆ کەسێك ژیانی نامۆییو دووره ولاتی دیتبێت زۆر سەختو دژواره، بۆیه هەمیشــه به بیستنی ناوەکەی ناخم دەهەژێو تەزوو بە رۆحمدا دێت.

کاتێك مــرۆ مالاوایی له دۆســتو ئازیزانو خۆشەویســتانی خۆی دەکات، هێنده گریان له گەرووییدا دەتاسێو فرمێسك به چاوانیدا دێنه خوارێ، ئەســرینو هەنسکی دۆستانیش دەرزی ئاژنی دڵی دەکەن، نالی ئاسا پەیمان دەدات که ئیتر بێ ئەوان سەفەر نەکات.

نـــەمـــردم مـــن ئـــەگـــەر ئـــەمـــجـــاره بـــێ تـــۆ
نـــەچـــم شـــەرتـــەن هـــەتـــا ئـــەوخـــواره بـــێ تـــۆ

چونکه دەترســێ کاتێك دەگەڕێتەوه (خــاكو خۆڵ) مەحبوبەکەی نەمابێ، ئەوسا دەبێت هەر بڵێ:

هـــەمـــوو ڕۆژێ لـــه تـــاو هـــیـــجـــرانـــی ئـــەمـــساڵ
تـــەمـــەنـــنـــای مـــردنـــی پـــێـــراره بـــێ تـــۆ

هەندێجار لەگەڵ ئەو کەســانەدا دیدار ئاخیرەت دەبین که دەستی دوعاخوازیمان بۆ بڵند دەکەنو مالاواییمان لێدەکەن، چەند ئەســتەمه مرۆ وەختێك بگەڕێتەوه که کەسانێك بۆ هەمیشه مالاواییان کردووەو ئیتر لەم دنیادا به دیداریان شاد نابێت!

یاخــود مــرۆ بگەڕێتەوه دوای ســەفەرێکی دوورو درێــژ، جگه له هەواری خاڵی چی دی بەدی نەکات!

بەجێهێشــتنی زێدو نیشتمانو ئەو شــوێنەی مرۆ تیایدا چاوی به دنیا هەڵهێناوەو به ئاووهەواکەی ئاشنایه زۆر لەسەر دڵان گرانه.

ئەو ساتەی مرۆڤ ڕۆحی بەو مرۆڤانە ئاشنا دەبێت کە لە ناخەوە بەڕاستی خۆشیان دەوێت‌و هۆگری بوون، ئیتر حەزناکات بۆ چرکەیەك بەجێیان بهێڵێت!

بــەڵام ئێمــە لەم ژیانەدا هەموو شــتێك بە دەســتی خۆمان نییە، ڕووداوەکان جۆراوجۆرن، وێڕای ڕووداوە ناخۆش‌و جەرگبڕەکان، ڕووداوی خۆشیشــی تێدا هەن، خۆمرۆ هەمیشــە هەر لە ناخۆشی‌و ناڕەحەتیدا ناژی، بەختەوەری‌و شادمانی لە کەلەبەرێکی ژیاندا، کونجێکی بۆ خۆی دروســتکردووە، وەلێ ســات‌و وەختی خۆشی‌و ئاســوودەیی زۆرکورتن، خانۆچکــەی بەختیــاری زوو زوو دەتەپێ، ســەرلەنوێ بنیاتنانی ئەو خانۆچکەیە وەختی دەوێ!

ئەســرین بۆ خۆی وشــك ناکات، لێوی هەڵقرچاو بە ئاسانی بزەی بۆ ناگەڕێتەوە، مرۆ کە ماوەیەکی زۆر دەســتەو ئەژنۆ دانیشت، هەروا بە زوویی ناتوانێ چوارمشقی دانیشێ‌و دەستی لە ملی ئەژنۆی داڕنێ!

وەلێ ئەوەشــت لە یاد نەچێت، ئەم ژیانەی ئێمە سەرەڕای دیمەنە تراژیدییەکانــی، گەلێك دیمەنی خەندەبەخش‌و شــادیهێنی تێداهەن، ئاســوودەیی بــە هەموو کونج‌و کەلەبەرێکی ناخی مرۆڤ دەبەخشــن، کەواتە ئێمە هەرگیز ڕقمان لە ژینی خۆمان نابێتەوە!

بــەڵام دەبێت وریابیــن‌و بزانین، کە ژیان گەمــەی منداڵان نییەو گرنگە ئاگامان لە هەموو چرکەیەکی هەبێت، چونکە ئێمە سەفەرێکی گەورەمان لەبەردەمدایە.

ئەم گەشــت‌و ســەفەرانەی لە ژینی دونیامانــدا ئەنجامی دەدەین،

کاتەکانــی خۆمــان دیاری دەکەینو پێشــتر خۆمانی بۆ ســازو ئامادە دەکەین!

جانتــاو بوخچەکانمان دەپێچینەوە، پێداویســتییەکانمان ئامادەن، پوڵو پارە، جلوبەرگ، پاسپۆرت، کاتی ڕۆیشتنو هاتنەوەمان دیاریکراوە!

بە کەیفی خۆمان ســاتو وەختی سەفەرەکەمان هەڵدەبژێرینو بە ئارەزووی خۆمان ماڵاوایی لە دۆستانمان دەکەین، بەڵێنی دیاریو شتی جوانیان پێدەدەین، بە ئومێدی دیدار بەجێیان دەهێڵین!

وەلێ سەفەری یەکجاری زۆر جیاوازە!

ئێمە کاتەکەی نازانین، کەســیش پێمان ناڵێت، خۆشمان بۆ ئامادە نەکردووە! کەشــکۆڵمان خاڵیو دەســتمان بەتاڵە، ناتوانین ماڵاوایی لە دۆستانمان بکەین!

ئەو ســەفەرە دووروودرێژە، هێندە نزیکە، دەکرێت لە هەر ساتێکدا پێمان بڵێت: ئامادەبە، هەرئێستا!

بەداخەوە ئەمە ئەو حەقیقەتەیە کە هەمووومان لێی بێئاگاین!!

ئەوەیە سەفەری غوربەتو نامۆیی، ئەوەیە دوورکەوتنەوەو هیجرانی دۆستو خۆشەویستان!

خۆشەویسترین کەسمان تا گۆڕستان لەگەڵمان دێنو دوای ئەوەی بە خۆڵ لە ژێرخاکدا دەمانشارنەوە، بە تەنیا جێماندێڵن!

لــە جیهانێکی ســەیرا، لــە غوربەتێکی تاڵدا، لە گۆڕێکــی تارا، لە دووتوێــی بەرگێکی ســپیدا، بەبێ هیچ یارو هاودەمێك فەرامۆشــمان دەکەن!

کەسانێك بۆمان دەگرین، بەڵام لە حاڵی ئێمە بێئاگان!

کەواتە پێویستە توێشووی ئەو سەفەرە لە ناکاوە ئامادەکەین، بێئاگایانە درێژە بەم ژینەمان نەدەین، هەوڵدەین سۆزو خۆشەویستی ئەو خودایە وەدەستبێنین کە ئەگەر هێندەی گەردیلەیەك لەو ئەوینەمان لە دڵدا بێت، ئەوا بۆ ماڵاوایی ئەو سەفەرەمان فریشتەکانی خودا بەڕێمان دەکەن، هەر ئەو فریشتە سپیو جوانو بێگەردانەش بۆ پێشوازی ئاسمان بە دەستەونەزەر بەڕێزەوە ڕادەوەستن!

با سەفەرەکانی دونیا، سەفەری قیامەتمان بێنێتەوە یادو هەمیشە ئەو ڕۆژەمان لە یاد بێت، کە بۆ دواجار ماڵاوایی لەم دنیایە دەکەین کە ئێستا ئالوودەی خۆشیو باقو بریقی ئەوین!

خۆئامادەکردن بۆ ئەو سەفەرەش، بەوە نابێت لە کونجێکی ژیاندا گۆشەگیربینو چاوەڕوانی مردن بکەین!

نا، بەڵکو ئەو مرۆڤەی خۆی بۆ ئەو سەفەرە ئامادە دەکات، لە هەموو کەس زیاتر سوود لەم ژیانەی وەردەگرێت، چونکە دنیا کێڵگەیەکە بۆ قیامەت!

سوود لە کاتەکانی وەردەگرێت، پەیامی خۆشەویستیو میهرو بەزەیی لە نێو مرۆڤەکاندا بڵاودەکاتەوە، هەمیشە بەرەو لوتکە بەرزەکان هەنگاو دەنێت! دەزانێت کە ئەو لە خۆڕا نەهاتۆتە دنیاو خوداوەند بەبێ مەبەست ئەوی نەخوڵقاندووە!

لە هەموو هەنگاوێکدا خودای لە بیرە، لێرەوەڕا نەخشە بۆ بەهەشتی نەبڕاوە دادەنێت، هاوڕێیانی سەفەری دەدۆزێتەوە، چونکە

ئەوانن دەستی دەگرن بەرەو ئەوێ! ئەو هاوڕێیانەی کە دەستو دڵو دەروونیان لە بەهەشتییان دەچێت، جگە لە ناکاری بەرزو دڵسۆزیو وەفاداریو خۆشەویستیو میهرو بەزەیی، هیچ ناکارێکی تریان لێ بەدی ناکرێت!

پەتی هەموو خۆشەویستییەك بە مردن دەپچڕێت، بەڵام خۆشەویستی لەبەر خودا تا نێو بەهەشت بەردەوامە!

دەبێت وریابین، کەسانێك نەکەین بە خۆشەویستی خۆمان کە بەرەو دۆزەخ دەستمان دەگرنو، لەوێڕا دەزانین کە ئەوان دوژمنی ئێمە بوون، نەك دۆست، بەڵام ئێمە نەماندەزانی.

هەموو خۆشەویستان ڕۆژێك دەبێت لە یەکتر دابڕێنو ئەم دنیایە بەجێبهێڵن، بەڵام خۆشیو سەرفرازی بۆ ئەو خۆشەویستانەی، لە سێبەری باخچەکانی بەهەشتدا بە دیداری یەکتر شاد دەبنەوە!

شەو درەنگەو دنیا کپو بێدەنگە، خەمی دووری تۆ هەموو هەستو نەستی وەکو تاریکایی شەو داگیرکردووم، ناچارم خامەکەم دابنێم!

هاودەمی خەمم دوای شەم هەر شەوە
ژووانی تەنیاییم ژێربالی ئەوە

بە ئومێدی دیدارێکی نزیك!

یاقوبی باوکی یوسف، سلاوی خودایان لەسەربێت، کاتێک یوسفی لێ دوور خرایەوە، هێندە گریاو فرمێسکی ڕشت سۆمای چاوی خامۆش بوو، لە خەمی یوسفی کوڕی هەردوو چاوەکانی لە دەستدان‌و لە کولبەی ئەحزانی خۆیدا، دەیان ساڵ فرمێسکی ڕشت‌و ئاهی سەردی هەڵکێشا.

هەمیشە وێنەی یوسفی لەبەردیدی خەیاڵ بوو، بە ئومێدی دیدار چرکەکانی ژیانی دەبردە سەر.

لێزمەی بارانی ئەمشەو فرمێسکەکانی یاقوبی پەیامبەری دێنامە یاد، دەبێت لە ماوەی چل ساڵی تەمەندا چەند فرمێسکی بەسەر ڕوومەتدا هاتبنە خوارو، بە لێوی هەڵقرچاوو دڵی شکاوەوە چەندێ سکاڵای دەردی دووری‌و هیجرانی یوسفی کردبێت، دەبێت چەند شەو خەو لە چاوەکانی تۆرابن‌و، نەیتوانیبێ بۆ ساتێک چاوەکانی لێک بنێ‌و وچانێک بدات!؟

خۆ ئەگەر بۆ ساتێکی کورتیش خەوی لێکەوتبێ، دەبێت چەندجار لە خەودا دەست لە ملانی یوسفی ئازیزی دڵی بووبێ‌و کاتێک لە پڕ بێداربۆتەوە خۆی بە تەنیا لە کولبەی ئەحزاندا بینیوەتەوە، ئەوسا دەبێت چۆن برینی کولابێتەوەو زامی کۆنی نوێ بووبێتەوە!

ساڵانێکی دووروودرێژ، نەیانتوانی یادو یاداشتی یوسف لە دڵی (یاقوب)دا نەک بسڕنەوە....

بەڵکو نەیانتوانی لاوازیشی بکەن!

تا ئەو کاتەی خودای میهرەبان، ئومێدی دیداری نوێی پێ خەڵات

کردن‌و هەردوو خۆشەویست بە یەکگەیشتن!

پەیامبەر یوسف لە باوکی پرسی: بابەگیان بۆچی هێندە فرمێسکت بۆ دووری من ڕشت تا بینایت کوێر بوو، خۆ تۆ دەتزانی کە ئەگەر لە دنیادا بە یەکتر شـــاد نەبین، لە ڕۆژی دواییدا، دوای مردن بە یەکتر شاد دەبووینەوە؟!

باوکی لە وەڵامدا گوتی: لەوە دەترسام کە تۆ بە باوەڕداری نەمری‌و ئەوســـا بۆ هەمیشـــە، دیدار ئاخیـــرەت دەبوویـــن‌و، هەرگیز بە یەکتر نەدەگەیشتین!

کەواتە هەموو خۆشەویســـتییەکان مەودایان کورتەو ئەگەر ئاوێتە بە خۆشەیســـتی خودا نەبن‌و لە پێناو خوادا نەبن، مەرگ بۆ هەمیشە کۆتاییان پێدێنێت!!

ئیبن‌و تەیمیە دەڵێت: هەموو خۆشەویستییەکان بە مەرگ کۆتاییان پێدێت، بەڵام خۆشەویستی لەبەرخودا ڕایەڵەی تا بەهەشتی نەبڕاوەیە!

وەها خۆشەویســـتییەك هەرگیز کۆتایی پێنایەت، هەمیشـــە نووری لە نێودڵاندا درەوشـــاوەیەو، وەکو ئەوینێکی ســـەرمەدی هەمیشـــە بە زیندوویی دەمێنێتەوە!

ئـــەو دڵانەی کە خۆشەویســـتی خـــودا بە یەکیانەوە گـــرێ دەدات، ڕۆحیـــان بەیەکتر ئاشـــنا دەبێت‌و ئاوێتـــەی یەکتر دەبـــن، هەروەکو ڕابیعەی عەدەوی دەڵێت:

قَدْ تَخَلَّلْتَ مَسْلَكَ الرُّوحِ مِنِّي

وَلِذَا سُمِّيَ الخَلِيلُ خَلِيلاً

هەر لەبەرئەوەشـــە، كە ئەو خۆشەویســـتانەی هەمیشـــە (كوردی) ئاســـا ئازیزانی خۆیان لەبەردیـــدی خەیاڵیان حازرەو لە دووری ئەوان فرمێســـك دەڕێژنو هەمیشە بە دڵ لە یەكتر نزیكنو بە چرپەی ڕۆح یەكتر دەدوێنن:

ڕۆژو شـــەو دایـــم لـــەبـــەردیـــدەی خـــەیـــاڵـــم حـــازری
سـا چ فـەرقـێکـی هـەیـە بـۆ مـن ئیتر ئـێـرەو ئـەوێ

ئەوان لە ڕۆژیی دواییدا لە ژێر سایەی عەرشی كردگاردا بە دیداری یەكتر شـــاد دەبن، پـــەروەردگار لـــەو ڕۆژە دژوارەدا بانگیـــان دەكات، خۆشەویســـتانی خۆی بانگ دەكاتو دەفەرموویت: كوان ئەوانەی تەنها لەبەرمن یەكتریان خۆشویستووە؟

ئەمڕۆ لە سایەی عەرشی خۆمیان دادەنێم، لە ڕۆژێكدا كە جگە لە سایەی من هیچ سایەیەكی دی نییە!!

ئازیـــزم: ئەوەی ئەمجۆرە خۆشەویســـتییەی تاقـــی نەكردبێتەوە، تا ئێســـتا تامی ئەوینو خۆشەویســـتی نەكردووە، ئەگەر ئەم وشەیەشـــی بیستبێت، ئەوا جگە لە فریودان هیچی تر نەبووە!

هەموو ئەو كەســـانەی كە بۆ جوانی، یان ماڵو ســـامانی دونیا، یان پلەو پایەو دەسەڵات، یەكتریان خۆشـــدەوێت، ئەوە خۆشەویستییەكی كاتییـــەو ڕۆژێـــك دادێت كۆتایـــی پێدێتو زۆرجـــار دەگۆڕێت بە ڕقو دووژمنایەتی.

ئەوینو خۆشەویســـتی خودایی، بەرهەمی نزای سەحەرو ئەسرینی سوجدەی ژێرباڵی شەوی درێژی زستانو، دوعاو پاڕانەوەی لێوی وشكی

ڕۆژووی ڕۆژە گەرمەکانی هاوینە!

ئەو زمانانە دەزانن گوزارش لە خۆشەویستی بکەن، کە هەمیشە پاراون بە یادی خودا، ئەو لێوانەن خاوەنی خەندەی ئەفسوناوی ڕاستەقینە، کە بەردەوام نووری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان لەسەر دەنیشێتەوە.

ئەو دەستانە دەریای میهرو خۆشەویستیو سۆزو ئەوینن، کە هەمیشە بەرەو بارەگای خودا بڵندن‌و، بەزەییو میهرەبانیو لێخۆشبوون بە ئاوات دەخوازن.

ئازیزەکەم: دڵانی خاوەن ئیمان، دەریایەك لە سۆز، زەریایەك لە میهرەبانی، تاڤگەیەك لە تیشکی زیوین، خەرمانێکن لە گوڵزاری موحیببەت ، ناسکن وەکو پەڕەی گوڵ، نەرمن وەکو ئاوریشم، سپین وەکو بەفر، هێمنن وەکو پەپوولە، تەنها لە نێو ئەو دڵانەدا، هەست بە ئارامیو دڵنیایی دەکرێت، ئەو دڵانە هۆگری ئەوینی ئیلاهین، هەر لە دنیادا هەست بەتامی بەهەشت دەکەن، هەر لەم دنیایەدا بۆن‌و بەرامی بەهەشتیان بەسەردا دێت!!

خۆشترین ساتەکانیان ئەو ساتەیە کە لەسەر بەرماڵی تۆبەو گەڕانەوە، فرمێسکی پەشیمانی دەبارێنن.

هەست دەکەن دەوڵەمەندترین کەسی دنیان، چونکە بەندەی خودایەکی دەوڵەمەندن!

هەست دەکەن، بەهێزترین کەسی دنیان، چونکە بەندەی خودایەکی بەهێزو دەسەڵاتدارن!

هەست دەکەن، دڵنیاترین، کەسی دنیان، چونکە بەندەی خودایەکن، ئەوەی ئەو نەیەوێت، نابێتو ڕوونادات!
هەســـت دەکـــەن کەس خۆشەویســـتی ئەوانی نییـــە، چونکە ئەوان خودایەکیان خۆشدەوێت، کە کەس لەو جوانترو قەشەنگتر نییە!!
بەڵکو هەموو جوانیو ڕازاوەیی دنیاو ڕۆژی دوایی دڵۆپێك نییە، لە دەریای جوانی ئەو!
ئـــەوان هەموو خۆشـــیو لەزەتەکانیان تاقیکردۆتـــەوە، بەڵام هیچ لەزەتێکیان نەبینی شـــیرینتر، لە لەزەتی بەندایەتیو سوژدەبردن بۆ پەروەردگارو نزیکبوونەوە، لە ئەوینداری ڕاستەقینە.
دەباچیتر لەو کاروانە پڕ نوورە، دوانەکەوین، با ئێمەش لە میحرابی ئەو ئەوینە بەرزەدا، لە ڕیزی ئەویندارانی ڕاستەقینەدا بەرماڵی خۆمان ڕاخەینو بە چاوی پڕ فرمێسـکەوە دەستی نزاو پاڕانەوە بڵند بکەین، سا ئەگەر لەم دنیایەش لێکدابڕاینو مەرگ مەودای ماڵاوایی نەداین.
ئەوا ژووانمان ژێرسـێبەری عەرشی کردگارە، لەوێ خۆشەویستانو ئەوینـداران هەمـوو چاوەڕێـن، چاوەڕێت دەکەم، چـاوت بۆ دەگێڕم، هیوادارم خودای میهرەبان زوو بە دیداری یەکترمان شاد بکات.
لە سـوژدەکانتدا لە بیرم نەکەی، هەمیشـە دوعـام بۆ بکە، خودا دامەزراومان بکاتو لە ڕێگای هیدایەت لانەدەین.
ئیبنو قەیم دەڵێت:
نەزانترین کەس ئەو کەسـەیە، لە کۆتایی سـەفەرەکەیدا، ڕێگا ون دەکات، کە زۆری نەماوە بگاتە مەنزڵگا!

دەمێــك بوو تاســەی دیداری نامــە نوورینەکانی بــووم، لە ناخەوە بیری وتە جوانەکانیم دەکرد، کە هەمیشــە بە بۆنی گوڵاوی وشــەکانی مەســتم دەکەن‌و بە بیســتنی دێڕ بە دێڕی نامەکانی، نوقمی شادمانی دەبم‌و ئاوێزانی هەســتی پاك‌و دڵی پڕ میهری مامۆستاکەم دەبم، دوور لــە وتەکانی ئەو هەمیشــە خۆم لە دنیای غەریبیدا دەبینم، هەمیشــە زایەڵەی دەنگە هێمن‌و لەسەرخۆکەی لە ناخمدا دەزرنگێتەوە، وشەکانی وەکو باوەشێکی نەرم، ئارامی بە دڵە پڕ لە خورپەکەم دەبەخشن، لە نێو وتەکانیدا وەکو شــانەی هەنگوین، دڵۆپ دڵۆپ هەنگوینی وشــەی پاك‌و بێگەردی دەرژێنە گەرووی تاڵم، بە گەیشتنی نامەکانی پەپوولەی خەندە وەکو تەرزە بەســەر لێومــدا دەبارێن، بەختەوەرییــەك دەبێتە میوانم کــە هەموو کونج‌و کەلەبەری لاشــەم داگیــر دەکات، ئەو بە وتە نەرم‌و ناســکەکانی ڕۆحی شەکەت‌و ماندووم دەدوێنێ، ئای ئەو مرۆڤانە چەند سەیرن، دەگرین تا ئێمە پێبکەنین، دەسوتێن تا نوورمان پێببەخشن!

دەمرن تا ئێمە بژین، بێدارن تا ئێمە بە ئارامی بنووین!

لە تاریکترین شــەودا، چران!! لە ساردترین شــەوە زەنگی زستانا، گەرمی‌و ســۆزو میهرەبانین! هیوای ســاتە دژوارەکانن، بۆ ئەم زەمانە ســەختە، هاوڕێی ڕۆحن، دڵی ســپی لەم ڕۆژگارە ڕەشەدا هەموو زێڕو زیوی دنیا دێنێت!

هەمــوو پەیامێکی نوێی، چەپکێ نووری زیوینە‌و ڕێگام بۆ ڕۆشــن دەکاتەوە!

درەنگانێکی شــەوبوو، وەکو هەموو شــەوێ دەســتم خستبووە ژێر

چەناگەمو یادی ئەو ڕۆژانەم دەکردەوە، کە چ ساتێکی خۆشبوون، لە ناخەوە گوێم بۆ مامۆستاکەم شلکردبوو، دەیگوت: ڕۆڵەکانم: دونیا شەرابی شەیتانە، ئەوەی مەستی ئەو شەرابە بێت، لە ئوردوگای مردووواندا بە پەشیمانیو خەسارەتمەندی بەخەبەردێت!

دەیگوت: ئازیزانم ئامۆژگارییەکەی حەسەنی بەسریتان لە بیرنەچێت، کە هەمیشە دەیگوت: (ئەگەر بینیتان خەڵکی لە مەیدانی دنیادا کێبەرکێتان لەگەڵ دەکەن، ئێوە لە مەیدانی ڕۆژی دواییدا کێبەرکێیان لەگەڵدا بکەن)!

لە ناکاو لە زەنگی دەرگا درا، دڵانی شەیداو ئەویندارانی ڕاستەقینە، هەمیشە لە دووری ڕا، بۆنو بەرامی مەحەببەتی خودایی دەکەنو هاوار دەکەن ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ﴾ یوسف: ٩٤.

نامەی مامۆستاکەم بوو، وەکو گەورەترین دیاری وەرمگرتو خستمە سەرچاوەکانمو تێر بۆنم کرد!

(عەزیزی من)، لە دڵدا پەرتەوازەییەك هەیە، تەنها ڕووکردنە خودا چاری دەکات!

تەنیاییەك هەیە، تەنها هۆگربوون بە خودا لە خەڵوەتی موناجاتا چارەسەرێتی!

خەمێك لە دڵدا هەس، تەنها شادمانی بە ناسینی زاتی خوداو ڕاستگۆیی لە مامەڵەکردنیدا لای دەبا!

نیگەرانییەك لە دڵدایە، تەنها بە ڕاکردن بەرەو لای خودا ئارام دەبێت!

گڕی حەسرەتێك لە دڵدایە، بە ڕازیبوون بە فەرمانو قەزاو قەدەری ئەوو ئارامگرتن نەبێت، تا قیامەت ناکوژێتەوە!

دڵان هەمیشـــە داوا دەکەن، سواڵکەری مەتاعی دنیان، وازناهێنن تا ئەو کاتەی خودا دەبێتە تەنها داواکراویان، ئەوسا ئیدی بۆلای شتێکی دی ئاوڕنادەنەوە!

دڵان هــەژارن! چاری ئەو هەژارییەیان تەنها خۆشەویســتی خوداو یــادی بەردەوامی ئەوو ئیخلاســی بەندایەتییە، خۆئەگەر هەموو دنیا ببەخشــی بە مرۆڤ، ناتوانێــت ئەو هەژارییە چارەســەر بکات، بۆیە مرۆڤەکان بێ خۆشەویســتی خودا، لە لوتکــەی هەژاریدان، با هەموو دنیایان لە ژێر دەستدا بێت!

دڵەکان نەخۆشـــن، شــیفای دەردی بیمارییان، تەنها دیداری خودای گەورەیانــە، لە ڕۆژی (مەزیدا) ئەو ڕۆژەی کە بە بینینی ڕووخســاری پەروەردگاریان دەگەنە چڵەپۆپەی سەرفرازیو شادمانی!

لە بەشی دووەمی نامەکەیدا بۆی نووسیبووم (وریای شیرینییەکەی بە)!

دەگێڕنەوە کابرایەك بە نێو دارســتانە چڕو دلگیرەکانی ئەفریقادا دەســوڕایەوە، لە دیمەنی دڵڕفێنی دارە بەرزەکانو، سەوزایی دارستانو گوڵوگوڵــزاری ڕەنگاو ڕەنــگو، جریوەو چریکــەی چۆلەکەو بولبول سەرســام مابوو، لەو کاتەدا کە مەستی بۆنی خۆشی دارستانو دیمەنە ڕەنــگاو ڕەنگەکانی بوو، لــە ناکاو گوێی لە نەڕەی دوژمنێك بوو، کەتا دەهات دەنگەکە نزیکترو گەورەتر دەبووەوە!

کاتێك کابرا ئاوڕی دایەوە، بینی ئەوا شــێرێك لە برســا نێو قەدی

باریکبــووە، بە خێراییەکی خەیاڵی بــەرەو لای ئەم ڕادەکات، کابرا تا برِستی تێدابوو، دەستی بە ڕاکردن کردو شێرەش بەدووی دا!

وەختێك کابرا بینی شـێرەکە نزیك دەبێتەوە، بیرێکی کۆنی بینی، لە ترســی شـێرەکە خۆی فرِێدایە نێو بیرەکەو بە گوریســەکەی کە ئاویان پێدەردەهێنا خۆی گرتەوە!

بە هەڵواسراوی لەمبەر بۆ ئەوبەری بیرەکە جۆلانەی دەکرد، هێشتا بە تەواوی هەناســەی ڕزگاربوونی هەڵنەکێشابوو، شێرەکە زۆر نەبوو بێدەنگ ببوو!

تەماشا دەکات لە خوارەوەی بیرەکەدا مارێکی گەورە دەفیشکێنێت، هــاوکات کە بیری لــە ڕێگایەك دەکــردەوە، بۆ ڕزگاربوون لە شــێرو مارەکە، دەبینێ وامشــکێکی ڕەش‌و مشکێکی سپی، خەریکن گوریسەکە دەکرۆژنو دەیانەوێت بیپچڕێنن!

کابــرا لە تاوا خەریکبوو شــێت دەبوو، بە پەلــە کەوتە جوڵاندنی گوریسەکە تا مشکەکان دوورکەونەوە!

بــە توندی لەمبەر بۆ ئەوبەری بیرەکــە جۆلانەی دەکردو خۆی بە دیواری بیرەکەدا دەدا، لەناکاو خۆی بە شــتێکی نەرمو لینجدا کێشــاو وەختێك ئانیشکی لێدا، سەیری کرد هەنگوینە.

کابــرا دەســتی بــە خواردنی هەنگوینەکــە کردو پەیتــا پەیتا بە پەنجەکانی هەنگوینەکەی دەلێســایەوە، بە شێوەیەك کە لەبەر شیرینی هەنگوینەکە بارودۆخەکەی لە یاد نەما، لە ناکاو بەخەبەرهات، چونکە ئەو لە خەوێکی ناخۆشدا بوو!

ئازیزم، کابرا بڕیاری دا، بچێتە لای کەســێکی شارەزا، تا خەوەکەی بۆ ڕاڤە بکات..

چووە لای زانایەکو خەوەکەی بۆ گێڕایەوە!

ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە لێی پرسی: ڕاڤەی خەوەکە نازانیت؟!

کابرا گوتی: نا!

زاناش دەستی بە ڕاڤەکردنی خەوەکەی کردو گوتی: ئەو شێرەی بە دووتا ڕای دەکرد، ئەوە فریشتەی ڕۆح کێشانە!

ئەو بیرەی کە مارەکەی تێدابوو گۆڕەکەتە!

ئەو گوریسەی خۆت پێوەهەڵواسیبوو، تەمەنەکەتە!

مشکە ڕەشو سپییەکە شەوو ڕۆژن، کە بەردەوام لە تەمەنت دەخۆن.

- قوربان ئەی هەنگوینەکە؟!

-ئــەوە ئەم دنیایەیە کە تامە شــیرینەکەی مردنو ڕۆژی قیامەتی لە بیر بردوویتەوە!

کەواتە با شیرینی دنیای فانی، کۆچو قیامەتمان لە یاد نەباتەوە!

کۆتایی نامەکەی بە چەند وتەیەکی زانای خوداناس سوفیانی سەوری هێنابوو، کە دەڵێت: (ئەگەر دەتەوێت دنیا بناسیت، بزانە لای کێیە؟!)

(پاشاکان قیامەتیان بۆ جێهێشتوون، ئێوەش دنیایان بۆ جێبهێڵن!)

(ئەگەر یەقین بە خودا لە دڵدا جێگیر بوو، ئەوا بەوپەڕی شادمانیو پەژارەوە دەفڕێت، بە تاسەی شادی بۆ بەهەشتو ترس و پەژارەش لە دۆزەخ!)

ئازیزم لە نامەکەتدا سکاڵادەکەی، لە دەستی (نەفسی ئەممارە)و وەیشومەی تاوانو گوناهو زاڵبوونی ئارەزووەکانو دەسەڵاتی نەگریسی شەیتان..

سـکاڵای تۆ، سـکاڵای هەمووـمانـە، دەردی تـۆ دەردی هەمووـمانە، ئێمەش گیرۆدەی تاوانو گوناهین، دەستەمۆی نەفسی بەدکردارو بەندو کۆتی دنیای فانیین..

تۆ بە ئاهی سەردو فرمێسکی گەرمت، دڵی منیشت وریاکردەوە!!

ئێمە هەمیشـە گێژاوی غەفڵەت، بێ ئاگامان دەکاتو بەشـێوەیەك مەستی خۆشییە کاتییەکانی دنیای فانی دەبین، کە تاوانو گوناهەکانمان بیردەچێتەوەو لە یادمان دەچێت کە ئێمە لەو ڕۆژەوە هاتووینەتە ئەم دنیایە، بەرەو گۆڕو مەنزڵگای قیامەت هەنگاو دەنێین!!

لەبەرئەوە وەکو (مەحوی) دەڵێت:

ئەسـیرو سەیدی قەیدی کەیدو شەیدی نەفسی ئەممارەم

لە دەسـت ئەم مارە بەدچارە، چییە چارەم، خوداچارەم!

چەند بە جوانیش گوزارش لە ناخی ئێمە دەکات، کە دەڵێت:

خەیاڵـی پوچـی دونیـا وا دەمـاغو دڵمـی پێچـاوە

قیامـەت، هـەر مەگـەر ڕۆژی قیامـەت بێتـەوە فیکرم

هەمووـمان وەدووی سەرابی دونیا کەوتووینو هەرچەندەی ڕادەکەین نایگەینـێ، هەر دەڵێین: ئەمڕۆ نا سـبەی، بە تـەواوی دەگەڕێینەوە، بۆ لای خوداوەندو دەسـتبەرداری تـاوانو گوناهەکانمان دەبین، بەڵام هێندەمان لەلا شـیرین بوون، نەفسو شەیتان هێندەیان ڕازاندۆتەوە، بەشێوەیەك ئاوێزانیان بووین ناتوانین وازیان لێبهێنین..



نامەکــەی تــۆ برینــی زۆرێکمــان دەکولێنێتــەوە، شــوێنەواری فرمێســکەکانت بە ڕومەتی نامەجوانەکەتەوە دەدرەوشێتەوە.. بێهیوا مەبە ئازیزم هێشتا دڵە سپییەکەت ژووانی خۆشەویستی خودایە!!

هەست دەکەیت کانیاوی فرمێسکت وشكو بێئاوەو باخچەی دڵە میهرەبانەکەت زەردهەڵگەڕاوەو نەرمەڵانی ناخت بۆتە بەردەڵانێکی ڕەقو تەق!!

هەق بە تۆیە، مرۆڤ لە وەها بارودۆخێکدا، ســەرفرازیو شادمانی ماڵاوایی لێدەکەنو دنیای لێ تاریك دەبێتو تروسکاییەك بەدی ناکات، بەســەر زەویــدا وەکو گەدایەکــی بێکەسو، دێوانەیەکی سەرلێشــێواو هەنگاو دەنێتو نازانێت ڕووبکاتە کوێ!!

چونکە مرۆڤ کاتێك هەستدەکات لە پەروەردگاری دوورکەوتۆتەوە، هەســت بە غوربەتو نامۆییەك دەکات، بەشــێوەیەك وا هەســتدەکات لەگەڵ خودی خۆشیدا نامۆیە!

گەورەترین خۆشەویســتی مــرۆی باوەڕدار، خودای پــەروەردگارە، ئــەو کات لەو خۆشەویســتەی دووردەکەوێتەوە، نــاری هیجران گڕ لە ناخــی بەردەداتو خونچەی خۆزگــەو ئاواتەکانی، بە گڕەی ئەو ئاگرە هەڵدەپروکێنێ.

ئەوەی خۆشەویســتەکەی خۆی وێڵ کردبــێ، ئیدی دەبێت بە چی دڵخۆشبێت؟؟

ئافرەتێك بە دەوری کەعبەدا تەوافی دەکردو بە کوڵ دەگریا، بە سۆزێکی بێسنوورو دڵێکی شکاو بە دەم نزاو لاڵانەوەوە فرمێسکی گەرمی دەڕشت..

لێیان پرسی: پێدەچێت کەسێکی زۆر ئازیزت لە دەستدابێت؟!

گوتــی: لــەو ئازیزتــر!!؟ مــن دڵی خۆم لــە دەســتداوە، من ویڵی خۆشەویستەکەی خۆمم، بە هۆی گوناهو تاوانەوە لە دەستمدا!!

کاتێك لە دەریای میهری خودایی دووردەکەوینەوە، ئەوسا دەزانین ئێمە بێ سۆزی ئەوو بێ میهری ئەو، چەندە سەرگەردانو ماڵوێرانین..

وەختێك دەبینین خودامان لێ زویرە، ئیتر خەندەو پێکەنینی دنیا دڵخۆشمان ناکەن..

وەختێــك لە تامو چێژی گفتوگــۆ، لەگەڵ خودادا، مەحروم دەبین، ئیتر تاموچێژی هیچ خواردنو خواردنەوەیەك ناکەین..

وەختێــك لە بەهەشــتی بەرینی خواپەرســتی پەراوێــز دەگرین، ژیانمان پەرێزێکی زەردەو، دڵیش خیابانێکی خامۆش.

ئیبنولجــەوزی لە بارەی بەهەشــتی ئیماندارانــەوە دەڵێت: (ئێمە لە بەهەشتێکدا دەژین، خۆراکەکەی خشوعە لە نوێژەکانماندا، خواردنەوەکەشی ئەسرینی چاوەکانمانە) (نَحنُ في جَنَّةٍ طَعامُها الخُشُوعُ، وَشَرابُها الدُّموعُ)..

ئازیــزم، مــرۆڤ ویڕای توانــاو بەهرەیەکی زۆر کە خــودای گەورە پێی خــەڵات کــردووە، لاوازی ڕووی تێدەکاتو دڵەکانیش هەمیشــە وەکو خۆیان نامێنن.

ئێمەی مرۆڤیش فریشــتەنینو ناتوانین بێ گوناهانە، بەسەر ڕووی زەویــدا گوزەربکەین، بــەڵام گرنگ ئەوەیە لەگــەڵ تاوانەکاندا تۆبەو گەڕانەوە فەرامۆش نەکەین!!

وەکو منداڵێکی دڵشکاوو بەندەیەکی هەڵاتوو بەرەو لای خوداوەندی میهرەبانو میهربەخشو بەسۆزو لێبوردە، بە کەساسی هەنگاو بنێین!!

خوداوەنـــدی ئێمە، (رحیم)ـە، (رحمن)ـــە، (غفـور)ە، (ودود)ە، (رؤوف)ـە، (غفار)ە، (تواب)ـە..

دەریای میهرەبانی هەموو دنیای داپۆشیوە..

خودای ئێمە، پێی خۆشـــە بیسەری (یا ربّ، یا ربّ)و (یا الله، یا الله)ی ئێمە بێت، لە بەرەبەیانی سەحەردا..

پێم سەیرە نووسیوتە لە نامەکەتدا، نازانم چۆن لە خودا بپاڕێمەوە، نازانم چۆن نزاو دوعاکانم بکەم..

هاوڕێی لە دڵاشیرینم: وەختێك ئەوینو خۆشەویستی خودا لێوانلێوی دڵـــەکان دەبن، ئیتر پێویســـت بە هیچ ڕەوانبێـــژیو بەیانێك ناکات، بۆ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی، دەستەکانت بڵندبکە، نیگات ببڕە عەرشی خـــودا، بڵێ: پەروەردگارم منی بەنـــدەی بچووکت ئومێدم بە گەورەییو فەزڵی بێسنووری تۆیە، بمبورە، لێمخۆشبە، دەستم بگرە، بەرەو لوتکەی نوورو هیدایەت، خۆم دەدەمە دەستی تۆ، تۆش بمخەرە ژێرساباتی سۆزو میهرەبانی خۆت، مەمدەرە دەستی شەیتانو نەفسی بەدکارم..

خودایـــە گوناهی من هەرچەنـــدە گەورەبن، ســـۆزو میهرەبانی تۆ گەورەتـــرە، خودایە تۆ بەندەی وەکو من خراپو زۆر باشیشـــت زۆرن، بەڵام ئەمن جگە لە تۆ خودایەکی تر شك نابەم!

ئەگەر تۆ لە دەرگای خۆتم وەدەرنێی، ئیتر لە دەرگای کێ بدەم؟؟

من هەر تۆ دەپەرستم، بۆ گەورەییت کڕنووش دەبەم، هەرچەندە شەرمەندەو خەجاڵەتم، بەڵام هەرگیز لە بەزەیی تۆ بێ هیوا نابم....!

﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

هێشتا خۆر ئاوا نەببوو، گوێم لەم سروده دەگرت:

قِفْ بِالخُضوعِ ونادِ يا اللهُ    إنَّ الكَريمَ يُجيبُ مَن ناداهُ

بوەستە بە ملکەچی‌و بانگکە (یا الله)، خودای میهرەبان وەڵامی کەسێك دەداتەوە کە بانگی دەکات..

بە دڵێکی شکاوو چاوێکی شەرمنەوە دەستی دوعام بڵند کرد، وەلێ لەو کاتەدا وتەکانی (ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) م هاتنەوە خەیاڵ، کاتێك لێیان پرسی: بۆچی ئێمە لە خودا دەپاڕێینەوە، بەڵام پەروەردگار دوعاکانمان قبوڵ ناکات؟

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: چونکە ئێوە خوداتان ناسیوە، بەڵام ملکەچی فەرمانەکانی نەبوون!

پێغەمبەرتان (ﷺ) ناسیوە، بەڵام گوێڕایەڵی سوونەتەکانی ئەو نەبوون!

قورئانتان ناسیوە، بەڵام کارتان بە ڕێنماییەکانی نەکردووە!

لە ڕزق‌و ڕۆزی‌و نیعمەتی خودا دەخۆن، بەڵام سوپاسی ناکەن!

بەهەشتتان ناسیوە، بەڵام داوای ناکەن‌و کاری بۆناکەن!

دۆزەختان ناسیوە، بەڵام لێی ڕاناکەن‌و خۆتانی لێناپارێزن!

شەیتان دەناسن، بەڵام دژایەتی ناکەن، بەڵکو کردووتانە بە دۆستی خۆتان!

دەزانن مردن هەیە، بەڵام خۆتانی بۆ ئامادە ناکەن!

دەچنە گۆڕستان‌و مردووەکان بە خاك دەسپێرن، بەڵام هیچ پەندو ئامۆژگارییان لێوەرناگرن..

عەیبو ناتەواوییەکانی خۆتان بیرچووەو بە عەیبی خەڵکییەوە خەریکن!

ئیتر چۆن دەتانەوێت نزاکانتان قبوڵ بێت؟!

تەماشا دەکەم هەموو ئەم شتانە لە مندا هەن، بەڵام هەر بێ ئومێد نەبووم لە میهرو بەخشندەیی خودایی، وێڕای تاوانو گوناهی بێ ئەندازەی ئێمە، دەرگای لێخۆشبوونی خودایی هەمیشە والآیە!!

هەرگیز نابێت لە بەزەییو میهرەبانی خودا بێ هیوا بین، هەرچەندە غەرقی گوناهو تاوان بین!

خودای گەورە، بەندەی تۆبەکاری خۆی خۆشدەوێت، لە کاتی تاوانو گوناهیشدا، پەردەی میهری خۆی، لەسەر بەندە گوناهبارەکانی خۆی لانابات!

ئیبنولجەوزی کتێبێکی نایابی هەیە، بە نێوی (بحر الدموع)، (دەریای فرمێسك)، تایبەتە بە چیرۆکی ئەو بەندانەی تۆبەیان کردووەو گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا!

تیایدا سەرنجێکی جوانی (بیشری حافی) باس دەکات، کە ڕۆژێك لەبەردەم دووکانی میوە فرۆشێك ڕادەوەستێت، پێی دەڵێت: دەڵێی ئارەزووی شتێك لەمانە دەکەیت؟

گوتی: نەخێر، تەنها سەرنجم لەوەدا کە خودای گەورە ئەم هەموو میوە خۆشو بەتامە، لە دنیادا بە کەسانێك دەبەخشێت، کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەنو لێی یاخین، ئەی دەبێت لە بەهەشتدا چی بەو کەسانە ببەخشێت، کە ملکەچی فەرمانەکانی بوونو سەرپێچییان نەکردووە؟!

خودایەك هێندە میهرەبان بێت، چۆن دەبێت ئێمە لە لوتفی بێهیوا بین؟!

مرۆڤ بەرامبەر بە وەها لوتفێکی بێ سنوور، سەری سوڕدەمێنێت، هەمیشە دەرگا والآیە، هەر کات بتەوێت بچیتە خزمەتی خودا، سکاڵای خۆت بکەی، موناجاتی لەگەڵ بکەی، بیدوێنیو دەردی دڵی خۆتی بۆ بەیانکەی، دەتوانیت!

چی لوتفێکە خودا گیان، ژووانی هەمیشە ئاوەدان، هەواری هەمیشە

ڕازاوە، میحرابی بەردەوام، بەرماڵی هەمیشـــە ڕاخراو، تۆ ئەی بەندەی گوناهبار، دڵۆپێك ئەســـرینو دوو دەستی بڵندو دیدەیەکی کزو دڵێکی شـــکاوو تەوبەیەکی ڕاست، هەموو گوناهەکانت دەشۆنەوە، خۆشبەختی کوچەو کۆڵانی دڵو دەروونت ڕووناك دەکاتەوە، ئای ساتەکانی موناجات، چ خۆشیو لەززەتێك بە مرۆڤ دەبەخشن..!!

ئازیزم، دەچینەوە خزمەتی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، پێی دەڵێن: مامۆستای زوهدو خوداپەرستی، ئامۆژگاریمان بکە بە شتێك سوودمان پێ بگەیەنێتو، توویشوو بێت بۆ گەشتی قیامەتمان!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم: کاتێك دەبینن خەڵکی ســـەرقاڵی دنیان، ئێوە سەرقاڵی قیامەتبن.

ئەگەر ئەوان خەریکی ڕازاندنەوەی ڕووکەشیان بوون، ئێوە خەریکی ڕازاندنەوەی ناخی خۆتان بن!

ئەگـــەر ئەوان خەریکی بنیاتنانی کۆشـــكو تەلاری دنیا بوون، ئێوە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی گۆڕو کۆشكو تەلاری قیامەتبن!

ئەگـــەر ئەوان خەریکی خزمەتکردنی مرۆڤـــەکان بوون، ئەوا ئێوە خەریکی خزمەتکردنی خودای پەروەردگاری جیهانیان بن!

ئەگـــەر ئـــەوان بە عەیبی خەڵکەوە ســـەرقاڵبوون، ئێـــوە خەریکی چاککردنی عەیبەکانی خۆتان بن!

هەوڵدەن، لەم دنیایەدا کەشـــکۆڵو توێشووی قیامەتتان ئامادەکەن، چونکە ئەم دنیایە کێڵگەیەکە بۆ قیامەت!

ئەمانـــە وتـــەی پیاوێکی حەکیمـــن، هیـــوادارم هەردووکمان وانەی جوانی لێوە فێربینو بیکەینە، مەشخەڵی ڕێمان.

هەمیشـــە دەتبینم، حوزن‌و ماتەمێکی ســەیر، ســەراپای ســیمات دادەپۆشێ‌و، لە چاوانتا خەمێکی قوڵ دەخوێنرێتەوە!

زۆرجار ئەم پرسیارەم لێدەکەیت‌و بە شوێنی وەڵامەکەیدا وێڵیت!

ئەم پرسیارەی تۆ لە پرسیارەکەی دایکی (ڕەبیعی کوڕی خوسەیم) دەچێت کە دەیگوت: ڕۆڵە هێندە بە خەمباری دەتبینم، هێندە دەتبینم دەگری، دەڵێی پیاوێکت کوشتووە؟!

ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: بەڵێ، دایەگیان ڕاســتەکەی من نەفسی خۆمم بە تاوان کوشتووە..!!

ئێمەی کڵۆڵ وەکو ئیمامی ئەحمەد دەفەرموویێت: کەسانێکی هــەژارو داماوین، ڕزقی خۆمان دەخۆین‌و چاوەڕوانی ئەجەلی خۆمان دەکەین!

کەواتــە جێی خۆیەتی، هەمیشـــە لە خەمی ڕۆژیـــی دواییدا بین‌و دڵمان بەم دنیای فانیە خۆشنەبێت‌و ئامادەی کۆچ بین!

ســـەیاری کوڕی دینار دەڵێت: خۆشـــحاڵی‌و شـــادمانی بـــەم دنیایەو خەمی ڕۆژیی دوایی، لە دڵی بەندەیەکدا جێگایان نابێتەوە، هەر کاتێك یەکێکیان لە دڵدا جێگیر بوو، ئەوی تریان ئەوێ بەجێدەهێڵێت..

ئازیزم:

ئێمە لەم دنیایەدا نامۆین، ڕێبوارێکی شـــەکەتین‌و بۆ چەند ساتێك لە سێبەری پڕ غروری ئەم دنیایەدا وچانمان داوە! چەند ڕۆژێکەو ئەم هەوارە دژوارە بە ئازارە بەجێدێڵین!

ئەی هاوار بۆ سەفەری درێژی ئاخیرەت‌و، کەشکۆڵی بەتاڵ‌و دەستی خاڵی..

ئەی هاوار بۆ تەنیایی گۆڕو، پرسیاری فریشتەکانو ڕاوەستانی مەحشەر!

عەتای سولەمی لە خودا دەپاڕایەوەو بە دیدی بە ئەسرینەوە دەیگوت: خودایە میهرو بەزەییت ببەخشە، بە غوربەتی دنیاو تەنیایی گۆڕو چاوەڕوانی درێژی بەردەستی خۆت، پەروەردگارم..

هەربۆیە سالحانو خۆشەویستانی خودا، هەمیشە لە سیمایاندا خەمو پەژارەیەکی قوڵ بەدیدەکرا...

وتەیان زیکری خوداو بێدەنگیان بیرکردنەوەو تێڕامانو، کردەوەیان خزمەتکردنی بەندەکانی خودابوو.

ئەوان دەیانزانی کە ئەوەی دەیەوێت، هۆگری لەگەڵ خودادا بەدەستبهێنێت، دەبێت دەستبەرداری هۆگربوونی خەڵکی بێت.!

ئەوەی دەیەوێت خۆشەویستی خودا بەدەستبهێنێت، دەبێت واز لە خۆشەویستی بێ کەڵکی مەتاعەکانی دونیا بهێنێت!

ئەوەی دەیەوێت پلەو مەقامی لای خودای دەستکەوێت، دەبێت دەستبەرداری پلەو مەقامی لای خەڵکی بێت!

ئەوان دەیانزانی، بۆئەوەی هەمیشە خودا بەو شێوەیە بێت لەگەڵیاندا کە خۆیان پێیان خۆشە، دەبێت ئەوانیش بەو شێوەیە بن، کە خودا دەیەوێتو پێی خۆشە..

ئەوان هێندە ژیرو دانیشمەندبوون، دەیانزانی کە هەر کاتێك ڕاستگۆیانە ڕوو بکەنە خودای پەروەردگارو ڕوو لە هەموو کەسێك وەرچەرخێنن، ئەوا هەموو کارەکانیان مەیسەر دەبێت.!

عەبدوڵای کوڕی عەون دەڵێت: ئەگەر کەسێك بە تەواوی ڕووبکاتە یەکێـك لە پاشـاکانی دونیا، ئەوا سـوودمەندو بەهرەمەند دەبێت، چ جای ئەو کەسەی ڕوو دەکاتە پاشای ئاسمانەکانو زەویو هەموو موڵكو سەروەتو گەنجینەکانی ئاسمانو زەوی، لە دەستی ئەودان؟!

لەبەرئـەوە ڕازیکردنی خـوداو کارکردن بـۆ ڕزگاری ڕۆژی دوایی، هەموو کاتو ساتەکانی ژیانی داگیرکردبوون!

هەمیشـە لە بیـری ئەوەدا بـوون، کاتی گاڵتەو گـەپو پێکەنینو ڕابواردنیان نەمابوو!

ئیبنولقەیم دەڵێت: (كُن للهِ كَما يُريدُ، يَكُن لَكَ فَوقَ ما تُريدُ)، بگونجێ بۆ خودا چۆن ئەو دەیەوێت، ئەویش بۆ تۆ دەبێت، لەسەرووی ئەوەی کە خۆت دەتەوێت!

بـەڵام ئازیـزم، ئەم حوزنو ماتـیو مەلولییە لـە ناخیدا لەزەتو خۆشـییەکی شـاردۆتەوە، کەوەکو نەسـیمی بەهەشـت، دڵەکان فێنك دەکاتەوەو ڕۆحەکان ئاسوودە دەکات!

کەواتـە خـەم بۆ خەمبـاریو بێدەنگیـم مەخۆ، من سـەرقاڵی گوناهەکانی خۆمم، بۆ ڕزگاربوون تێدەکۆشـم، لەبری ئەوەی بەدووی عەیبەکانـی خەڵکیدا بگەڕێـم، عەوداڵی عەیبەکانـی خۆمم، لەبری ئەوەی سەرزەنشتی خەڵك بکەم، ئەوا سەرزەنشتی خۆم دەکەمو هەوڵی ڕاستکردنەوەی خۆم دەدەم.

بـا لێـرەدا خەمباربیـن، تـا لـە ڕۆژی دواییـدا سـەعادەتو سـەرفرازی ئەبـەدی بەدەسـتبهێنین، بـا لەوانەبیـن کـە لەسـەر

کورسـییەکانی بەهەشـت بەرامبـەر بـە یـەك دادەنیشـنو دەڵێن:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴾

حوزنـی ئێمـە تەنها ئەو کاتە دەڕەوێتەوە، کە فریشـتەکان پێمان دەڵێن:

﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴾

بۆ کەسـێك مردن کۆتایی بە ژیانو هەموو خۆشـییەکانی بهێنێت، حەیفە بە دنیا فریو بخواتو دونیای فانی لە بەهەشتی باقی مەحرومی بکات!

ژینی دونیا، بەندیخانەی باوەڕدارە، هەموو ساتێکی کە تێدەپەڕێت، قۆناغێکە بەرەو ئازادی، بەرەو سەرکەوتنی ئەبەدی..

﴿ ... فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾.

لە منداڵیمەوە شێتو شەیدای خوێندنەوەو عاشقی کتێبم، وەبیرم نایــە یەکــەم کتێب چی بــوو کە بە زمانــی کوردیــم خوێندۆتەوە، هەرچەندە هەرچیم کەوتبایەتە بەردەســت دەمخوێندنەوە. بەتایبەت چیرۆکــی منداڵان کە تائێســتاش ئــارەزووی دەکەمو لــە ڕێگایانەوە دەچمەوە دونیای منداڵیم، وەلێ ئەوەندەم لە یادە کە زۆر بەتاسەوە یــەك بە یەکــی (زنجیرەی هاوەڵانــی پێغەمبــەر)م -درودی خودای لێبێت- دەخوێندەوە لە نێو هەمووشــیاندا لە بیرمە زۆر سەرسامی کەسایەتی عەبدوڵای کوڕی حوزافە بووم!

بــەڵام زۆرباشــم لە یادە کە یەکەم کتێبم بــە تەواوەتی بە زمانی عەرەبی خوێندبێتەوە کتێبی (نوور الیقین، فی سیرة سید المرسلین). محمد خضری بەگ بوو!

لە کۆڕەوی ساڵی ١٩٩١ دا ، بە ئاوارەیی لە کوردستانی ئێران نیشتەجێی شاری کامیاران بووین، نازانم چۆنم ئەو کتێبە دەستکەوت، بەڵام هێندە دەزانم خۆشترین ساتەکانی ژیانم لە خزمەتیدا بردە سەر!

ئەمن خۆم بە تەبیعەت حەزم لەسەر گوزەشتەو ژیننامەو یادەوەری نووسەرانو کەڵەپیاوانو ناودارانە.

لە ژینو بەسەرهاتی ئەوان سوود وەردەگرمو تەواوێك بەهرەمەند دەبم، وەلێ ژیاننامەی سەروەری مرۆڤایەتیو پەیامبەری ئاخری زەمان جیاوازە لە هەموو ژیننامەو بەسەرهاتو یادەوەرییەك!!

مــرۆڤ نازانێــت چی بڵێــت بەرامبەر بــە خۆرێك لــە ئاڵتوون، دەریایەك لە زیو، دنیایەك لە میهرەبانی، ئاسمانێك لە سۆز، باوەشێك

لە خۆشەویستی، لێزمەبارانی بەخشندەیی!

لـە بەرامبـەر کەسـایەتی (موحەممـەد)دا، چی کەسـایەتییەك دەتوانێت باس لە خۆی بکاتو بتوانێت بێتە پێش؟!

هەزار ڕەحمەت لە (حەسانی کوڕی ثابت) کە لە وەسفیدا دەفەرموێت:

وَأَحسَنُ منكَ لَم تَرَ قَطُّ عَيني وَأَجمَلُ منكَ لَم تَلِد النساءُ
خُلقتَ مُبَرَّءً من كُلِّ عَيبٍ كَأَنَّكَ قَد خُلقتَ كَما تَشاءُ

واتە: لە تۆ زیباترم چاو پێنەکەوتووە، هیچ دایکێك کۆرپەیەك لە تۆ جوانتری نەهێناوەتە دنیا.

هێندە بەرزو جوانو کامڵو بێ عەیبی، هەر دەڵێی لەسـەر ویستی خۆت خودا بەدیهێناویت!

هـەر بۆیـە مـرۆڤ سەرسـام دەبێـت لە کەنـار دەریـای نووری موحەممەددا، دەسـتی تێڕامانی دەخاتە ژێر چەناگەی سەرسـوڕمانو نازانێت لە کوێوە دەسـت پێ بکات، کەسـێك خودا لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە پێی بفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ (٤) القلم

عائیشە خانمی دایکی باوەڕداران لە وەسفیدا بفەرموێت: (كانَ خُلُقُهُ القُرآنُ)..

جادەبێت خامەی نووسـەران چی بکات بەرامبەر مرۆڤێك کە لەو ڕۆژەوە خـۆر هەڵاتووەو تا ئەو ڕۆژەش خۆر ئاوا دەبێت، جیهان وەها مرۆڤێك نابینێتەوە!

ئێمە تەنها بەرامبەر ژیننامەی زانایەك نین تا باسی زانستو پلەی زانستی بکەین!

ئێمــە تەنها بەرامبەر مرۆڤێکی چاکخــوازو میهرەبان نین، تا باس لە میهرەبانی بکەین!

ئێمە تەنها بەرامبەر باوکێکی میهرەبان، یاخود هاوسەرێکی بەوەفا، ڕابەرێکی دڵسۆز،

بەڕێوەبەرێکی کارامە،

سیاسەتمەدارێکی شارەزا،

جەنگاوەرێکی ئازاو مەردو ئاشتیخواز نین!

بەڵکــو بەرامبــەر ژینناممــەو مرۆیەکین کە هەموو ئەم وەســفانە دڵۆپێکن لە دەریای میهرو ســۆزو خۆشەویستی ئەو سەرکردە بەرزەی کە ڕێڕەوی ڕەوڕەوەی مێژووی گۆڕی!

دونیا بێ (موحەممەد) -دروودی خودای لێبێت- واتە تاریکســتانو جاهیلیەت، شەوەزەنگی نەفامیو وێڵبوون لە دەیجوردا!

ژیان بێ (موحەممەد) -دروودی خودای لێبێت- واتە جەنگەڵستانێك کە تێیدا گەورەکان بچکۆلەکانو بەهێزەکان بێهێزەکان دەخۆن!

مرۆڤایەتی مالاوایی دەکاتو، مرۆڤەکان سروشتی مرۆڤانەی خۆیان لەبیر دەکەن!

ئازیزەکــەم، ئێســتا بە تەواوەتی دەزانین، کە ژیارو شارســتانییەت بــەرەو چی هەڵدێرێك دەڕوات، چونکە دوورە لە ڕۆشــنایی ڕێنماییو ڕێبازی پاکی ڕابەری شارســتانیەتو ژیاری ڕاســتەقینە، پەیامبەرمان موحەممەد (ﷺ).

هاوار بۆ شارستانییەتێك کە دوورە لە ﴿رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ ەوە!

خۆشەویستم: لەم ڕۆژانەدا کە دوژمنانی مرۆڤایەتیو پێکەوەژیانو ڕێزگرتــن لە بەهــا مرۆییــەکان، دەیانەوێــت بەرامبەر بــە ڕابەری مرۆڤایەتی، سوکایەتی بنوێنن، زۆر توڕەو نیگەران بووم، بەڵام کاتێك هەڵوێســتی بــەرزی ئەو گەورە مرۆڤــەم دەهاتەوە یاد، کە هەمیشــە بەرامبەر بەو کەســانە دەینواند کە (بەشــێتو جادووگەرو شــاعیرو درۆزن)، ناوزەندیــان دەکــرد، دەیفەرمــوو: (اللَّهُمَّ اغْفِـرْ لِقَوْمِـي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) هێمن دەبوومەوە!

بەرامبەر بە ئاکاری بەرزی خەجاڵەت دەبووم، چونکە (موحەممەد) (ﷺ) واتە نەرمترین دەســت، جەریری کــوڕی عەبدوڵا دەڵێت: هیچ ئاوریشمو دیباجێکم بەردەست نەکەوتووە، نەرمتربێت لە لەپی پیرۆزی پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت)، هیچ بۆنێکم نەکردووە، خۆشتربێت لە دەســتی پیرۆزی، هەروەکو دەســتی لە کەشــکۆڵی گوڵاوفرۆشــێك دەرهێنابێــت، هێندە بۆنی خۆشــبوو، هەر ئــەو دەفەرمووێت: (هیچ کاتێك نەبوو، تەماشام بکات، ئیللا بە خەندەوە بۆی ڕوانیوم)!

ئازیزم، لەگەڵ گەیشتنی نامەکەم، دەست بە خوێندنەوەی ژیننامەی ســەروەرمان بکــەو لە دەریای میهرو ســۆزو بەزەییو بەخشــندەییو خەندەی زیوینو باوەشــی گەرمی ئەوینو خۆشەویســتیدا نووقم بە، ژیانی ئەو بکە بە چراو پێشەنگی ژیانت!

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ الأحزاب



گەڵاڕێزان هاتووە
ناخی باخی گرتووە
گەڵای زۆری وەریون
سینگی باخی پۆشیون
تاوناتاوێ شنەی با
بە ئەسپایی دەیان با «شەریف»

وەرزی پایز مچورکەیەکی ساردە، وەکو کزەی خەزانەکەیو ناخی مرۆڤ، وەکو ناخی ئەو باخە دەهەژێنێ کە شاعیر وەسفی دەکات.

هەمیشە بە هاتنی پایز، خەم دەبێتە سیمای کەون، ڕووی زەردی گەڵای وەریو بە دەم شەپۆلی باوە، ڕووتبوونەوەی درەختە سەوزەکان، وەرینی گوڵە جوانەکان، سەمفۆنیایەکن تك، تك، حوزنو ماتەمیان لێدەتکێت!



Scanned by CamScanner




# نامەی دەیەم

منیـــش بەرامبەر دیمەنی خەزانو گەڵاڕێـــزان، مات دەبمو نوقمی بەحری ئەندێشە دەبم.

درەختی تەمەن، هەر ڕۆژەی گەڵایەکی دەوەرێت، ڕۆژێك دەبێت لە پایـــزە خەزانێکدا دوای وەرینی دوا گەڵای پـــەڕاوی تەمەن دابخرێتو مرۆڤ ماڵاوایی لەم دنیایە بکات!

ئازیـــزم، حـــەز دەکەم بـــە یەکەوە، تەواوی شـــیعرەکەی شـــەریف بخوێنینەوە، چونکە بە تەعبیرێکی سەیر گوزارش لە هەستی دەروون دەکاتو ئەو دیمەنە وەها وێنا دەکات، کە پایز لە تابلۆیەکی سامناکدا بە دیواری تەمەندا هەڵدەواسێت!

باخــەوان کــزو تەنیــا
لەســەر ئــاوی کانیــا
دەســتی پیــرو لەرزۆکــی
داناوەتــە ســەرچۆکی
بەســەر بیــری پــڕ داخا
چــاوی دەکێشــێتە باخــا
دارێکــی وشــك و مــردوو
لانــەی مەلــی کۆچکردوو
نــە ســەوزایی نە ســێبەر
نــە ئاهەنگــی پەلــەوەر
لــە بیــری نابــێ هەرگیز
گەڵاڕێزانــی پایــز
وا دڵپــڕی کردبــێ
ناخــی گیانــی گرتبــێ
جــارێ ســەری دائەخــا
ســەرنجی کانــی ئــەدا
ئاوێنــەی ڕووناکــی ئــاو
وێنــەی دێنێتــە بەرچــاو
وێنەی پیــرو زەردی خەم
پڕچیــن و خەتــی ماتــەم
وێنەیەکــی پــەژارە دیــو
وێنــەی گوڵــێ هەڵوەریــو
فرمێســکی ژینــی تاڵــی
دێنێتــەوە خەیاڵــی

باخـــەوان بۆیە وا خەمبارە، چونکــە دەزانێت، ئیدی تەمەنی لاوی بەسەرچوو، گەر بەهاریش بگەڕێتەوە، بە ئەم چی؟!

بۆیە لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

ئەوسا بەهارێ بێ تین
ئێستا پاییزی خەمین
گەڵاڕێزانیش ئەڕوات
هاکا بەهارێ تر هات
تەنها ژینی من وایە
ئیتر بەهاری نایە!

ئازیزم، با پێش ئەوەی بەهاری تەمەن ماڵاواییمان لێ بکاتو بکەوینە بەرخەزانی پایزی تەمەن، سود لە تەمەنمان وەربگرین، ڕۆژانە مەڵۆی نوێ، بخەینە سەر خەرمانی، کرداری جوانمان، کەشکۆڵی ئاخیرەت بە (زادی تەقوا) پڕ بکەینو بۆ گەیشـــتن بە هەمیشـــە بەهاری نەبڕاوەی بەهەشت، خۆمان سازو تەیار بکەین!

ســـاتو چرکەکانمان، ڕۆژانە بە پـــاچو قوڵینگ لە چیای تەمەنمان دەتاشـــن، دەبـــا ئێمەش بە تاشـــەبەردی ئەو چیایە، کۆشـــکو تەلاری بەهەشتمان دروست بکەین!

تەمەن مۆمێکی داگیرساوە، هەر ڕۆژەو دڵۆپێکی دەتوێتەوە!

تا ئەو ساتەی بۆ هەمیشە خامۆش دەبێت!

دەبا پێش توانەوەی مۆمی تەمەن، خەزانی دوا گەڵای عومر وەخۆکەوین!

بۆئـــەوەی لـــە دوای تەمەنـــی فانی، بە ژینێکی باقی هەمیشـــەیی بەهرەمەند بین!

لەگەڵ ڕێژنەی بارانەکەدا هۆن هۆن فرمێسکەکانم بەسەر ڕوومەتما دەهاتنەخوار.

بەرامبەر بە سۆزو بەزەیی‌و میهرەبانی خواوەند شەرمەندەبووم، بەزەیی‌و میهرەبانی پەروەردگار لە شەپۆلی باران‌و نەسیمی بەرەبەیان‌و تیشکی خۆر فراوانترە، ئەگەر میری ئەو نەبا ئێمە چیمان دەکرد؟

بێ سۆزی ئەو لەچی سەرگەردانییەکدا دەژیایین؟

بەرامبەر ئەو سۆزە بێسنوورە، جگە لە خەجاڵەتی هیچ شتێکی ترم لەدەستنایەت!

ئێمە گوناه دەکەین، وەلێ ئەو دەرگای لێخۆشبوونمان بۆ دەکاتەوە، ئێمە دڵەکانمان کردۆتە لانەی تاوان، وەلێ ئەو بە بارانی ڕەحمەتی خۆی، کوچەو کۆڵانەکانیشمان بۆ پاك دەکاتەوە، ئێمە هەمیشە هەڵدێین، وەلێ ئەو بە ﴿يَٰعِبَادِيَ﴾ بانگمان دەکات، بەدبەختین ئێمە! بۆ کوێ ڕادەکەین؟ لە کێ ڕادەکەین؟

لە دەریای میهری خودایی ڕادەکەین، بەرەو بیابانی وشك‌و بێ ئاوی ئەهریمەن!!

باوەشی ئارامی فریشتەکان جێدەهێڵین، بۆ ژێر چەپۆکی ڕەشی شەیتانۆچکەکان!

ڕێگای نوورو شەقامی چراخان وێڵدەکەین‌و لە کۆندەرەی تاریکستاندا چنگەکرێ دەکەین، لەبری دۆستایەتی پەروەردگاری میهربەخش، ئیبلیس دەکەینە دۆست، لە کاتێکدا خودا لەبەر باوە گەورەی ئێمە نەفرەتی لێکرد، چونکە ئەو دوژمنی ئێمەیە، ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾﴾ الكهف.

ئازیزم: چی لەزەتێك بۆ بڕوادار لە نزیکی لە پەروەردگار خۆشترە؟

ئەو کاتەی ئێمەی بەندەی بچووك، ئاوێتەی بەندایەتی دەبین‌و

ڕووی دڵەکانمان دەکەینە خواوەندو دڵمان جگە لە خۆشەویستی ئەو لە هەموو خۆشەویستییەك خاڵی دەبێت، ئەوسا وەکو سوفیانی سەوری دەڵێت: هەرکات هەموو مرۆڤەکانت لە دڵت دەرکرد، ئەوا هەرچی داوابکەی لە خودا پێت دەبەخشێ!

ئەو دڵانەی کە جێگای یادی خودان، تەنها بە یادی ئەو ئارام دەگرن ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد.

بەکری موزەنی دەڵێت: کێ وەکو تۆیە ئادەمیزاد، هەرکاتێك بتەوێت دەستنوێژ هەڵدەگری‌و دەچیتە میحرابی خەڵوەت‌و موناجاتی ئیلاهی! لەگەڵ خودای خۆتدا دەدوێیت بێ تەرجومان!!

ئـەو دڵانە چەندە ئاوەدانن کە هەمیشـە لە کـۆڕی زیکرداں، ئەو سۆمایانە چەند گەشن کە هەمیشە بە ئومێدی دیداری کردگار ئەسرینی ئەوین دەڕێژن، ئەوانە یادی خودایان لە هەنگوین لەلا شیرینترە!!

ئیبنولقەیم دەفەرموێت: کاتێك خەڵکی بە دنیا دەوڵەمەندن، تۆ بە خودا دەوڵەمەندبە! کاتێك خەڵکی بە نازو نیعمەتی دونیا دڵخۆشن، تۆ بە خودای خۆت شادمانبە! کاتێك خەڵکی بە خۆشەویستانیان هۆگرن، تۆ تەنها هۆگری خودابە! کاتێك خەڵکی دەچنە لای پادشـاو گەورەکانی خۆیان‌و داوای پارەو سامانیان لێدەکەن، تۆ لە خودای خۆت نزیکبەرەوە، تەنها داوا لە ئەو بکە!

یەکێك لە پێشینان دەڵێت: لاوێکم بینی لە ڕێگای مەککە بە تەنیا ڕێگای دەبڕی، پێمگوت: هەست بە تەنیایی ناکەیت؟ گوتی: هۆگریم بۆ خودا، هەموو تەنیاییەکی وەبیربردوومەتەوە!

گوتم: لە کوێ دەتوانم بتبینم؟ گوتی: لە دونیادا هەرگیز چاوەڕوانی دیداری من مەبە! بەڵام ڕۆژی دوایی ڕۆژی کۆبوونەوەی خواناسانە!

گوتم: ئەی لە ڕۆژی دواییدا لە کوێ بۆت بگەڕێم؟ گوتی: لە کۆڕی ئەوانەدا بۆم بگەڕێ، کە شادن بە دیداری ڕوخساری کردگار!

پێمگوت: چۆن دەزانیت کە تۆ لەوانیت؟

گوتی: بـەوە دەزانم کە چاوم لە تەماشـاکردنی هەموو حەرامێك پاراسـتووەو لـە هەمـوو شـتێك کە لێـی قەدەغە کـردووم خۆم بە دوورگرتـووەو هەمیشـە داوام لێکـردووە: کە بەهەشـتی من دیداری ڕووخساری پەروەردگارم بێت. پاشان کەوتەڕێ، تا لە چاو ونبوو!

یەحیای کوڕی موعازی ڕازی لە دوعاکانیدا دەیگوت: «*خودایە لەوانەمان نەژمێریت کە بە زمان بانگێشە بۆ تۆ دەکەن‌و بە دڵانیش لێت دووردەکەونەوە! ئەی بەڕێزترین لەلامان، نەمانکەی بە بێڕێزترین لەلای خۆت*».

سەیرە، ئازیزم، زۆر سەیرە، چۆن بە دەستی خۆمان، لە خۆشترین لەزەتـی دونیا، خۆمان مەحروم دەکەین لەبری ئەوەی دڵمان گوڵزاری موحیبەتی ئیلاهی بێت، بۆتە وێرانەو وشکەڵانی تاوان‌و گوناە!

بەڵام هەموو دەردێك دەرمانی هەس، پێشـینان دەڵێن: دەرمانی دڵ لە پێنج شتدان:

«خوێندنـەوەی قورئان بە بیرکردنەوەو تێڕامانەوە، سـکی خاڵی بەڕۆژو، شەونوێژ، نزاوپاڕانەوەی سەحەر، هاودەمی پیاوچاکان»

خۆشەویستم...

شەو درێژە، کورتی مەکەرەوە بە خەو!

ڕۆژگار ڕوونە، تاریکی مەکە بە تاوان!

خودایە بە نووری ئیمان دڵانمان ڕۆشـن‌و بە خۆشەویسـتی خۆت هۆگرمان بکەیت، بە سـۆزو میهرەبانیت بمنابەخشی‌و بە بەزەیی بێ سـنوورت بمانبوری، ئێمە هەرچەندە گوناهباربین، خۆمان تەنها بە بەندەی ملکەچی تۆ دەزانین، خۆمان بە تۆ دەسـپێرین، لە دەسـتی نەفس‌و شەیتان ڕزگارمان بکە، پەروەردگاری مە.

بەهرەکانـــی خوداوەند هێندە هێندە زۆرن لە ژمـــاردن نایەن، وەلێ ئێمە هەمیشـــە فەرامۆشـــیان دەکەیـــن‌و بە سوپاســـێکی کەمیـــش وەفاداری نانوێنین، تـــا ئەو کاتەی کە خوداوەندی میهرەبان بە لوتفی خۆی بۆ ئەوەی وەخەبەرمـــان بهێنێت لە خەوی غەفڵەت، بە دەردێك گرفتارو بـــە بەڵایەك موبتەلامان دەکات، تا گەورەیی خوداو بچوکی بەندەکانی دەرکەوێـــت، تـــا میهرەبان‌و دلۆڤانی خـــودا بۆ بەنـــدە گوناهبارەکانی ئاشـــکرابێت، تـــا بەندەکانی پێش ئەوەی لە ســـزای ســـەختی خودای بەهێزو باڵادەســـت بترسن، بەرامبەر بە سۆزو ڕەحمەتی شەرمەزاربن، تا جارێکی تر بۆ لای ئەو بگەڕێنەوەو فرمێسکی پەشیمانی بڕێژن..

ئەو کاتەی مرۆڤ بە دەردێك ئالودە دەبێت‌و لەسەر جێگا دەکەوێت، ئەوسا دەزانێت کە لەشساغی تاجێکە بەسەر مرۆڤە تەندروستەکانەوەو تەنها نەخۆشەکان دەیبینن!

بێکەسی شاعیر ڕاستدەکات کە دەڵێت:

مـــــــەڵێ هـــــــــــەزارم کـــوفـــری نـــیـعـمـەتـە
لـــەشـــی ســـــاغ بـــۆ تـــۆ مـــولـــكو ســـەروەتـــە

ئەو کاتەی ئاوی زوڵاڵت لەسەر زار تاڵ‌و هەنگوینت لە گەرودا دەبێتە "عەلقەم"، ئەو کات دەزانی خۆشی‌و لەزەتەکانی ژیان چەند بێبەهان!!

ئازیزم، نەخۆشـــی هەلێکە بۆ پشـــووی ڕۆح‌و ســـاتێکە بۆ تێڕامان‌و وردبوونەوە لە ژیان‌و، بەخۆداچوونەوەو ئامۆژگاری‌و خۆناسین!

مرۆڤ لە کاتی نەخۆشـــیدا، لە جیهانی ماددە دووردەکەوێتەوەو بە دیدی بەسیرەت، لاوازی‌و دەستەوەستانی خۆی بۆ دەردەکەوێت!

چیدی بەهێزو بازوو سەروەت‌و سامانی خۆی، نانازێ‌و دەزانێت چەند

لەلای خودا ئاسانە لە چاوتروکانێکدا، هەموو ئەو شتانەی لێبسەنێتەوە.

ئەگەر چەند ڕۆژێکی نەخۆشی، ئاوا دنیا لەبەرچاومان ڕیسوا بکات، ئەی چی دەکەین بۆ ئەو شـەوەی سـەرینمان بەردی ڕەقو پێخەفمان خۆڵو خاکو مەنزڵمان گۆڕی تارە؟!

سـەلەمەی کوڕی دینـار دەڵێت: ئێمە نامانەوێـت بمرین، تا تۆبە دەکەین، تۆبەش ناکەین تا دەمرین!

بـاش بزانە بە مردنی تۆ بازاڕەکانی دونیا داناخرێت، تۆ زۆر لەوە چکۆلەتری، خۆت بناسە!

گەنجێتـیو لاویو جوانـیو دەوڵەمەندی هەمـوو میواننو لە ناکاو جێمان دێڵن، ڕۆژانە تەمەن بەڕێدەکەینو لە داهاتووی گەورە بێ ئاگاین!

گیرۆدەی خـەوی غەفڵەت، کۆتو بەندی شـاوەتو ئارەزوو، دڵمان مردوو، لە تاڵی سپیو سەری ڕوتاومان بێ ئاگا، سەرخۆشی بێ شەراب، مەسـتی یاریو گاڵتەو قسـەی بـێ مانا، کەی پەشـیمان دەبیتەوە لە تاوانەکانـت، کەی چاوێك بە عەیبەکانتدا دەخشـێنی، تا کەی ئازاری ڕۆحت دەدەیت، دڵت بە گوناهو تاوان کرمێ دەکەیت، تەمەنت بۆ دونیای فانی بەزایە دەدەیت، کێ دەڵێت لەم نەخۆشییەت هەڵدەستیتەوە؟

چیـت ئامادەکـردووە بۆ دوا هەناسـەت؟ ئەو ڕۆژەت لـە یادە کە هەناسەت سـوار دەبێت، دەنگت خامۆش دەبێت، بیناییت لێڵ دەبێت، ناتوانی بە وتەیەك ماڵاوایی لە دەوروبەرو خۆشەویستانت بکەیت!!

یەکێـك لە پیاوچاکان دەڵێت: دەبینیت کەسـێك ئالـودەی تاوانە، گەر لێی بپرسیت: دەتەوێت بمری؟ دەڵێت: نا، چۆن حەز بکەم بمرم، بـەم هەموو تاوانەوە؟! خۆ ئەگەر پێی بڵێی: ئەی بە تەمانیت واز لە

تاوانەکانت بهێنیت؟ دەڵێت: نامەوێت وازیان لێبهێنم! ناشمەوێت بمرم تا وازیان لێنەهێنم!!

سەیرە، ئازیزم، زۆر سەیرە!

ئیبنوجەوزی دەڵێت:

(كَلامُـكَ مَكتوبٌ، وقَولُكَ مَحسـوبٌ، وأَنت ياهذا مَطلوُبٌ، ولَـكَ ذنوبٌ وَما تَتوُب، وشمسُ الحياةِ قد أَخَذَتْ في الغرُوب فما أقسى قَلبُك بَين القلُوبِ).

دەبـا ئیتر کۆتایـی بەسـەرگەردانی بهێنین‌و لە خـەوی غەفڵەت وەئاگابێین، بەڵکو دڵۆپە فرمێسکی بەرەبەیانێك، ئاهو نزای سەحەرێك، کۆتایی بەم تاریکستانی تاوانە بهێنێت‌و خوداوەند بە لوتفی خۆی، بە نووری تەوبە دڵمان ڕووناك بکاتەوە.

ئەبو سـەعیدی خەرراز دەڵێت: کاتێك کە خواترسان دەگرین، ئەوا بە ئەسرینی چاویان بەڵێن لەگەڵ خودادا دەنوسن!

ئەگـەر تا ئێسـتا لـە دنیادا ماوی‌و خـودای میهرەبان لەشسـاغی پێداویت، خۆت ئامادە بکە بۆ ئەو ڕۆژەی بۆ دوا چرکەی ژیانت، مردو شـۆرو کفنبڕ، چاوەڕوانت دەکـەن‌و گۆڕهەڵکەنیـش دەیەوێت زووتر کارەکەی تەواو بکات.

فرسەتەو بیرەوە هۆشی خۆت، ئەمڕۆ نەك سبەی!

ئەم دنیایە، جگە لە ماڵی نەخۆشی‌و نەداری‌و خەم‌و پەژارە، شوێنی پشوو نییە!

بۆچی بۆ خەوێکی سەراب ئاسا، نەعیمی ئەبەدی لە دەستی خۆت دەدەی؟

خێراکە، زۆر دواکەوتوویت، تۆبەکاران واگەیشتنە لێواری بەهەشت، تۆش هەر گوێ لە مشتی نەفس‌و شەیتانی!

ماموّستا گیان وتەکانت وەکو زەمین لەرزە، هەموو جەستەی هەژاندم، تەزووی بە ڕۆحمدا هێنا لەو ساتەوە تۆم بەجێهێشت بە دەم هەنسکی گریانێکی قوڵەوە نەمزانی چۆن گەیشتمە ماڵەوەو خۆم هاویشتە باوەشی دایکمو وەکو منداڵێکی ساوا تەسلیمی گەرمەشینو گریانێکی بێ سنوور بووم!

بەرامبەر بە لوتفو بەزەیی و گەورەیی خودا هەستم بە شەرمەزارییەك کرد، کە نەمدەتوانی سەرم هەڵبڕم ....

منی بەندەی گوناهبار چیم؟! خودا هێندە دەرگای هیدایەتم بۆ واڵا بکاتو، بەرامبەر بە گوناه و تاوانو غەفڵەتم، میهرو بەزەیی و میهرەبانی بنوێنێت!!

دیداری منو تۆ ماموّستای بەڕێزم شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو، چی قەدەرێکی سەیر بوو کە منی بە تۆ ئاشناکرد!!

هەمیشە هەستێك بەرەو خودا بانگی دەکردم، بەڵام من تاوانو دەوروبەر مەستی کردبووم، لە نێوان قاقای پێکەنینو ئاهەنگو شایی و داوەتو هەڵپەڕکێدا، بۆ بەختەوەری دەگەڕام، بەڵام لە گەرمەی پێکەنینو شادیمدا لە ناخمدا خەمێکی تاڵ دڵی دەگوشیم!!

هەمیشە چرپەیەکی هێمن ئامۆژگاری دەکردم، وریای دەکردمەوە، بەڵام دەنگەکە زۆر کزو لاواز بوو، لە دەنگە دەنگو غەڵبەغەڵبی بێ ئاگاییدا کپ دەبوو!

گومانم نەبوو لەوەی کە وێڕای گوناهـ و تاوانم، خودام خۆشدەوێت!

سەرەتا پرسیارەکەی جەنابتم بەلاوە سەیر بوو: ئەی چۆن خودام

خۆشناویت!؟

ماموّستا گیان، زۆرن ئەو کەسانەی وەکو منن، خودایان خۆشدەویت سوژدەی بۆ دەبەن، لێی دەپاڕێنەوەو نزای بۆ دەکەن، خۆیان بە بەندەی وی دەزانن، وەلێ لە هەمان کاتدا بەندەی شاوەتو ئارەزووەکانی خۆیانن، ناتوانن بە تەواوی خۆیان لە دەســتی نەفسو شەیتان قوتارکەن، باڕو بریــقو تامو لەزەتی خۆشــییە فریودەرەکانی دونیا، هێندە هەســتو نەســتی داگیرکردوون، بەهەشتی بەرینی خودای وەبیر بردوونەتەوە .....لە ســزای سەختی ڕۆژی دوایی بێ ئاگان، مردنو زیندوبوونەوەیان فەراموشکردووە!!

بە خەیاڵ وەدووی شــادمانیدا وێڵن، بەڵام وەکو هەنگێك کەوتبێتە نێــو هەنگوینی خــۆی، تا دێت لــە نێویدا نوقم دەبێتو ســەرەنجام لەوانەیە نەتوانێت خۆی ڕزگار بکات !!

ئەمن ئێســتا دەزانم خۆشەویستیم بۆ خودا زۆر سادەو ساکار بوو، هەرگیــز خوداوەندێکــی وەها گەورەو بەدەســەڵات و میهرەبان ، وەها خۆشەویستییەکی شایەن نییە!

ئیبنولقەیم دەگێڕێتەوە: کە مشــکێك عاشــقو شــەیدای وشترێك بوو، زۆری خۆشدەویســت، ڕۆژێك داوەتی کرد بۆ ماڵی خۆیان، کاتێك کە وشــترەکە ماڵە بچکۆلەکەی مشــکی هاوڕێی بینی، پێی گوت: یان خانوویەك دروســت بکە شیاوبێت بە خۆشەویستت، یا خۆشەویستێك بگرە شایان بە ماڵەکەت بێت!!

ئیبنولقەیمیش دەڵێت: تۆش یان ڕووبکەرە خودا بە دڵێك شــایانی

ئەو بێت، یا خودایەك پەیداکە شایان بە دڵی تۆ بێت!!

ئەو ڕۆژە تێگەیشــتم کە بەندایەتی بۆ خودا وتەیەکی سەرزارەکی نییە، تەسلیم بوونو ملکەچبوونە بە خودا، بە فەرمانەکانی.

بە دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی دەســەلمێت ئێمە تەسلیمی خوداین، یا نەفسی ئەممارە!؟

کاتێك لە ژێر باڵی ڕەشی شەودا ئارەزووەکان هێرش دێنن، ئەو کاتە خودامــان دێتەوە یادو لە شــەرمی خوداوەند، چاوەکانمان دادەخەینو ڕووی دڵەکانمان دەکەینە ئەو!

مانایەك بۆ خۆشەویستی خودا نامێنێت کە من بەندەی خوداوەندم، بەڵام ملکەچــی فەرمانەکانی نەبم، کە داوام لێدەکات باڵاپۆشــبم، لە ڕووکــەشو ناوەڕۆکدا پــاكو بێگەردو پاکیزە بــم! تاوانم لەلا بچوك نەبێت!!

فوزەیــل دەفەرمویت: هێندەی تۆ گوناهت لەلا بچوك بێت، لەلای خودا گەورەیەو هێندەی لە لای تۆش گەورە بێت لەلای خودا بچوکە!!.

ئەمــڕۆ دەمەوێت بەڕاســتی بۆ لای خۆشەویســتی گــەورەی خۆم بگەڕێمــەوە....... بە فرمێســکی پەشــیمانیو هەنســکی شــەرمەزاری، لاپەڕەی ڕەشــی تاوانەکانم بســڕمەوە، دڵی بەردم بە فرمێســکەکانم نەرمکــەم، بچمە میحرابی بەندایەتی ڕاســتەقینەو بەرەو بەهەشــتی نەبڕاوەو ڕیزوانی خودایی بکەومەڕێ.

ئیتــر ناهێڵم، هیــوام بە دونیای فانیو هاودەمــی خراپو نەفسو شــەیتان تۆبەم پێ دوابخەن، نامەوێت تەمەنــی جوانیم بەندایەتیو

ملکەچی بۆ شەیتان بێتو، تەمەنی پیریو لاوازیم بەندایەتی بۆ خودا بێت!!

نامەوێــت چیــدی ئەو جوانییەی خــودا پێی بەخشــیوم، لە بری سوپاسگوزاری، بۆ تاوان بەکاریبهێنم!!

نامەوێ چیدی لە شوێنێکبم، کە خودا پێیناخۆشە!

دەمەوێت ئیتر هەڵگری پەیامی نوورینی ئەوبم، دەمەوێت گوڵەباخو گوڵفرۆش بم!

نامەوێت لەم دنیا، مەستی کەیفو سەرابی تاوان بمو لە ئاخیرەتیشدا مەنزڵگای دۆزەخو خۆراکو خواردنەوەم زەقنوم بێت!

پەیمانەو بە خــودای خۆمی دەدەم، ئیتر من ڕێگای نوورینی خۆم دۆزییەوە، چیدی ناگەڕێمەوە تاریکستان.........

ئیتــر من تامی بەندایەتیم کردوەو، ســوژدەیەك بۆ خوداوەند بە هەموو خۆشییەکانی دونیا ناگۆڕمەوە.......

ئێستا من قوتابی پێغەمبەرم (درووددو سەلامی خودای لەسەربێت)، بە ئومێدی ئەو ڕۆژەم کە بە دیداری شاد دەبم، بە دەستی ئەو جامی شــەرابی کەوسەر نۆش دەکەم، من ئەو پەیامبەرە میهرەبانە بەسۆزە، پڕ میهرو ئەوینەم هەبێت، چۆن دەبێت بۆ پێشەوایەکی دی چاوبگێڕم.

مژدە ، مامۆســتام موژدە، من بوومە چرایەکی پڕ نوور، بە نووری پاکی ئەم ئیسلامە، مونەوەر بووم..

ئەوەنــدە چــاوی پــڕ بــێ نــووری پــڕ نــوورو مونــەوەر کــرد

کــە نەرگس چــاوە چــاوی نوورییە لەو نــووری چاوانــە!! «مەحوی»




# نامەی چواردەیەم

ئازیزی من، لە نامەکەتدا گلەیی لە نەفسی خۆت دەکەیت، بەرامبەر بە خوداوەند خۆت بە شەرمەزار دەزانیو هەستدەکەیت بەندایەتییەك کە بۆ پەروەردگاری مەزنو بالادەستی ئەنجام دەدەیت، بە تەواوی وشە شایان بە خودای گەورە نییە!

رۆڵەی شـیرینم، وتەگەلێك لە قسەکانی تۆ زێتر نین، کە گوزارش لە سکاڵاو دەردی دڵی هەمووان دەکات!!



شەرمەزاری شتێکە زۆر کەم بەرامبەر بە وشەی «عبودیة»، یاخود بەندایەتی بۆ خوداوەند "معبود"ی گەورەو خاوەن فەزڵ.

ئیمامی سەعدی لە تەفسیرەکەیدا سەبارەت بە مانای ئایەتی ﴿فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ﴾ دەفەرموێت: واتە ئارام بگرە لەسەر بەندایەتی بۆ خوداوەند، موجاهەدەی نەفسی خۆت بکەو بە تەواوی بەندایەتی بەو "عبودیة"ە هەڵسەو بە پێی توانای خۆت کاملی بکە، بۆ کەسی عابدو خوداپەرست خۆشترین لەزەتو چێژوەرگرتن لەو بەندایەتیەدایە، بە شێوەیەك هێندە دڵی پەیوەست دەبێت، کە هەموو شاوەتو ئارەزوویەك کە دڵی پێوە بەند دەبێت، فەرامۆشی دەکات.

بەڵام کاری دڵ وەها ئاسان نییە، مێشو مەگەزی نەفسی ئەممارە بە سانایی حەڵوای شاوەتو ئارەزوو فەرامۆش ناکەن!!

کاتێك دڵ هەموو سەودایەك وەلا دەنیو ئاوڕ لە دنیا ناداتەوە، کە بە خۆشەویستی خوداو لەززەتی بەندایەتی لێوان لێو بووبێت، ئەگەر نا ئەوا لاشە سەرقاڵی بەندایەتییە وەلێ دڵ یاری دەکات!

مەخابن ئەزیزم مەخابن!!

من چۆن بتوانم باسی شتێك بۆ تۆ بکەم کە من هێشتا نەگەیشتوومەتە کەناری دەریای ئەو «عبودیة» گەورەیە!

یەکێك لە پێشینان دەڵێت: بناغەی بەندایەتی ئەوەیە کە جگە لە خودا، داوای هیچ شتێك لەکەس نەکەیت!

هیچ شتێك!!

سەهلی تەستوری دەڵێت: (هیچ ڕێگایەك نزیکتر نییە بۆ گەیشتنی بەندە بە خودای خۆی، لە دەربڕینی هەژاریو ئاتاج بۆ خودا...

ئەوەش وەکو "شێخ الاسلام دەفەرموێت: کاتێك بەندە بەڕاستی

ڕووی هــەژاریو موحتاجی، دەکاتە خوداو بە تەواوی ئیخلاس، هاواری بــۆ دەکاو پەنای پێدەبات، ئەو کاتە خودا نـــزای قبوڵ دەکاتو بەڵای لەســـەر لادەبـــاتو دەرگاکانی ڕەحمـــەتو میهری خۆی بـــۆ دەکاتەوە، ئەمەیە ئەو بەندەیەی کە تامو چێژێکی وەهای نزاو پاڕانەوەو تەوەکل بە خودای کردووە، کە کەسانی تر نەیانچەشتووە!!

ئەم تامو چێژەیە کە ئێمەی بە دوودا وێڵین!

هەربۆیـــە دەیانگـــوت: خودایە ئەمە خۆشـــیو لەززەتی ئێمەیە، لە کاتێکدا لێت دەترســـین، ئاوا ئێمە هێندە بەیادت خۆشـــحاڵین، دەبێت ئەو ڕۆژەی لە عەزابت دڵنیا دەبین، بکەوینە چی خۆشییەکەوە؟!

هەربۆیە هەروەکو عاشـــقێك چەندە بە تاســـەی دیدارو جێ ژوانە، زێتر بە تاســـەی هاتنی شـــەوبوون، چونکە شەو ژووانی بڕوادارانە، بە ئاواتەوە بوون بژین تا دەگەنە شەوێ، تا لە میحرابی خودا پەرستیدا بە ئۆخژنی دڵیان بگەن!

ئەبو ســـولێمانی دارانی دەڵێت: خوداپەرستان لە شەودا لە خۆشیو لەزەتێکـــدان، زێتر لە خۆشـــیو لەزەتی ئەهلـــی ڕابواردنی دونیا، خۆ ئەگەر عیبادەتی شەوانم نەبا مانەوەم لەم دنیایەدا نەدەویست!

ئازیزم، ئەوان ژیانی دونیایان نەدەویست، بۆئەوەی تیایدا ڕابوێرنو لە نێو شاوەتو ئارەزوو باقو بریقی دنیادا کەیفو شایی ساز بکەن!

کچۆڵەیەکی نازداری خەڵکی بەســـرە لەســـەرە مەرگدا بە حەسەنی بەســـری گوت: ئەبو ســـەعید، پـــاش تۆزێکی تر خۆڵ دەکرێ بەســـەر گەنجیو جوانیمداو، هێشتا لە خودا پەرستی تێرم نەخواردووە!

ئەبو ســـەعید، تەماشـــای دایکم بکە وا بە باوکـــم دەڵێت: گۆڕێکی فـــراوان بۆ کچەکەم ئامادەبکـــە، بە کفنێکی باش دایپۆشـــە، بە خودا

ئەگەر بۆ مەککەش بەرێ کرابام، زۆر دەگریام، چ جای کەوا بۆ تاریکی گۆڕو تەنیایی‌و خانەی تاریکی‌و کرم، بەرێ دەکرێم!!

لەبەرئەوەبوو پیاوچاکان‌و ساڵحان، لەسەرە مەرگدا فرمێسکیان بۆ ماڵاوایی لە نوێژو دوعاو پاڕانەوەی سەحەر دەڕشت!!

ئەوان دەیانگوت: ئەوەی خودای خۆشبوویت، لە خزمەتیدا ماندوو نابێت، بەڵکو لەززەت لەو ماندووبوونە وەردەگرێت:

حَسْبِيَ اللهُ وَأَنِّي كُلَّما ضاقَتِ الأَيامُ زادَ النَّعَما
إن يَكُنْ راضٍ وَعَيشي أَلَمٌ كُنْتُ في الدُّنيا أُحِبُّ الأَلَما

واتە: خۆشەویستو هۆگری دڵم تەنها خودایەو هەرکاتێك ناڕەحەتی ڕۆژگاریش ڕووم تێبکات، بە زیادبوونی نیعمەتی خودای دەزانم!!

خودایە ئەگەر تۆ لێم ڕازی بیت‌و هەموو ژیانم ئازارو ئەشکەنجە بێت، ئەوسا کە دەزانم ئەو ئازارە خەڵاتی تۆیە، پێی خۆشحاڵ دەبم‌و خۆشمدەوێت.

موعازەی عەدەوی دەیگوت: سەیرم دێت لە چاوێك دەخەوێت، لە کاتێکدا دەزانێت ڕاکشانی نێو تاریکی گۆڕ چەندە تولانییە!

عونەیزەی بەغدادیش دەیگوت:

كُنْ للهِ اليومَ، كَما تُحِبُّ أن يَكونَ لَكَ غداً.

ئەمرۆ بۆ خودا بە، بەو شێوەیەی کە پێی خۆشە، تا ئەویش سبەی بۆ تۆ بێت، وەکو ئەوەی پێتخۆشە!

کەواتە: با وریا بین، موتەریفی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: مردن هەموو خۆشی‌و نیعمەتێکی تێکداوە، ئێوە نیعمەتێك داوا بکەن، کە مردنی تێدا نییە!!

نازیــزم لەم نامەیەم بەدوا حەزدەكەم لە گوڵزاری ژینی پێشـینان، چەپكە گوڵی ڕازاوەت بكەمە دیاری، تا هەمیشە مەستی بۆنی میسكو عەنبەری كردارو گوفتاری جوانی ئەوان بیت.

دڵەسپییەكەت بە شەونمی وتە جوانەكانیان خاوێنتر بكەیتەوەو لە جیهانێكی پاكو بێگەردو فریشتە ئاسادا ساتەكانی ژیانت بەسەربەریت!

ئەوان بە نووری ئیمان شەقامی هیدایەتیان بۆ ڕووناك بووبووەوە، دەیانزانی چی دەكەنو بەرەو كوێ دەچن.

ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم دەڵێت:

دارُنا أمامَنا، وحياتُنا بَعد وَفاتنا ـ فإمّا إلى الجَنّة وإمّا إلى النّار.

واتــە: مەنزڵمان لە پێشــمانەوەیە، ژیانمــان دوای مردنمانە، لەوە دواش، یا بۆ بەهەشت، یا بۆ دۆزەخ!

هەربۆیە هەمیشــە ڕێبواری ئەو ڕێگایە بوون، بۆ ئەو مەبەستەش ســەرەتا لە دڵی خۆیانەوە دەســتیان پێكردووە، زۆر ئــاگاداری بوون، چونكــە ئەوان دەزانن كە دڵ وەكو چۆلەكەیەك وایە، ڕۆژانە دەیانجار ئەم چڵو ئەو چڵ دەكات!

دڵ، وزەو توانــای ســەفەرە بەرەو خودا، پێشــینان دەڵێن: بیابانی دونیا بە پێیان دەبڕین، بەڵام بیابانی بەرەو ئاخیرەت بە دڵ!

ســەعیدی كوڕی جوبەیــر دەڵێت: ئەگەر یادی مردن ســاتێك دڵم جێبهێڵێ، ئەوا دڵم وێران دەبێتو تێكدەچێت!

ئەوان هەمیشــە دڵیان بــە خەمی ڕۆژی دوایی ئــاوەدان كردبۆوە،

مالیکی کوڕی دینار دەڵێت، دڵ ئەگەر خەمی تێدا نەبێت، وێران دەبێت، هەروەکو چۆن ماڵێك کەسی تێدا نەبێت وێران دەبێت!

حاتەم دەڵێت، دڵان دەسوڕێنەوە وەکو پەروانە، یا لە دەوری عەرشن، یا لە دەوری زبڵدانی شاوەتو ئارەزووەکان.

دڵ پاشای هەموو ئەندامەکانی لاشەیە، ئەگەر ئەو پاشایە باش بێت، ئەوا هەموو ئەندامەکان سەربازی ئەونو گوێڕایەڵی دەکەن، دڵ کانگای تەقواو عبودیەتو ملکەچ بوونو کانگای خۆشەویستیو ئەوینی خودایە.

کارەکانی دڵ بناغەی هەموو کارێکن، دڵە سەرچاوەی تەوەکوللو ترسی خوداو هیوا بە خوداو ئیخلاسو ئارامگرتنو ڕازیبوونو خۆشەویستی لەبەر خوداو، ملکەچ بوونو تەسلیم بوونی تەواو!!

هەرکاتێك دڵەکان پاکبوونەوە ئەوا چاوەکانمان، زمانمان، هەستو ئەستو خۆشەویستیمان هەموو پاك دەبن!

گرنگیدان بە دڵ کاری پیاوچاکانی ژیرە..

ئەوان دەیانزانی کە دڵ تەنها بە یادی خودا ئارام دەبێت، بە خۆشەویستی خودا ئاسودە دەبێت..

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد.

دەیانزانی کە تەنها دڵە سپیو بێگەردەکانە لە ڕۆژی دواییدا ڕزگاریان دەبێت، ئەو دڵانەی لە هەموو گومانو ئارەزوویەکی خراپ بێگەردن، ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ الشعراء.

گەورەترین بەڵاو نەخۆشیش دەردی دڵانە، کاتێك دڵەکان نەخۆش دەکەون بە دەردی حەسودیو ڕقو کینەو تاوانو گوناەو زوڵمو ستەم،

کرمی دەبن!

ئیتر دەبنە تاریکستانی ئەنگوستە چاوو تاریکایی تاوان دایاندەپۆشیو نەخۆیان تامی ئاسودەیی دەکەنو نەکەسیش چاوەڕوانی خێریان لێدەکات!

ئەو کەسەی دەیەوێت، خودا خۆشەویستی خۆی پێ ببەخشێت، با دڵی پاك بکاتەوە، خودا خۆشەویستی خۆی، تەنها بە دڵە پاكو بێگەردەکان دەبەخشێت. ئەو دڵانەی سپین وەکو بەفر، پاکن وەکو گوڵ، ڕووناکن وەکو مانگە شەو، ئەو دڵانەی کانگای سۆزو ئەوینو میهرەبانین!

سەلمانی فارسی بە ئافرەتێکی گوت، شوێنێکی پاکم دەوێت بۆ نوێژ، پێی گوت، دڵت پاك بکەرەوە، هەموو شوێنێك پاکە!!

کەواتە با پێش پاککردنەوەی لاشەو جلوبەرگو جێگەو ڕێگامان، دڵەکانمان خاوێن بکەینەوە!

با لە نەخۆشییەکان بیانپارێزین، سەرەتا لە یەکەمینو خراپترین نەخۆشی ئەویش، تەکەببور.

یەکەمین تاوان لە مێژوودا تاوانی دوژمنی گەورەمان «ئیبلیس».

ئێمە زۆر سەیرین، بۆچی لەخۆمان بایی دەبین، لە کاتێکدا لە «دڵۆپێك ئاو خولقاوین»، سەرەتامان خۆڵە، گرانبەهاترین بەرگمان بەرهەمی کرمە کە « ئاوریشمە»!

شیرینترین خواردنمان کە هەنگوینە، بەرهەمی «هەنگە»!

دوا مەنزڵگاشمان چاڵێکی تەنگە لە ژێر گڵدا.

لە گڵەوە بۆ گڵ!!

دوای چەند سات‌ێك لە مردنمان، خۆشەویستانمان لێمان بێزاردەبن، خۆئەگــەر دوای چەنــد ڕۆژێــك لە گــۆڕدا بمانبینن، بێزیــان نایەت تەماشامان بکەن!!

کەواتــە شــەرمەزارییە بۆ مرۆ فیــزو تەکەببــوری هەبێت، ئەمە نەخۆشییە، بەڵایە، خاوەنەکەی موبتەلای دەردێکی کوشندەیە!

دووەم نەخۆشیش لە مێژوودا حەسودی‌و ئیرەیی!

قابیل بۆچی هابیلی کوشت؟!

دەتەوێت: شادمان‌و ئاسودەو ئارام بژیت؟

حەسودی بە کەس مەبە، دڵت بە حەسودی بۆگەن مەکە...

ئەســمەعی دەڵێت: کابرایەکم بینی تەمەنی (١٢٠)ســاڵ بوو، پێم گوت: تەمەنت چەند درێژە!

گوتی: وازم لە حەسودی هێناوە، بۆیە ماوم!!

نەخۆشــییەکانی تر بەجێدەهێڵم بۆ خۆت، بەڵام هەوڵبدە دڵت بە ســپێتی بپارێزی، تا هەموو شــتێکت لا ســپی بێت، لەو دڵە سپییەی تۆشەوە تیشکی زیوین بەرەو دڵەکان هەنگاو بنێت‌و ڕووناکیان بکاتەوە.




# نامەی شانزەیەم

ماموّستا گیان ئەو ئێوارەیەی کە پێش ماڵاوایی سەبارەت بە خۆشەویستی خوداو موناجاتی ئیلاهی بە وتە شیرینەکانت کەمەندکێشی ڕۆحت کردم، دوای ئەوەی دوا وتەت ئەوەبوو کە گوتت: بە خودات دەسپێرم، دەتدەمە دەستی خودا.. هەمیشە خودات لە بیربێت، ئەگەر



خۆشەویستی خوداوەندت بەدەستهێنا ئیدی خەمت نەبێت ئەوا هەموو هیواو ئاواتو خوزگەکانت لە ژێر دەستدایە، وەلێ خودا نەکا، ئەگەر نەتتوانی خۆشەویستی خودا بەدەستبهێنیت، ئەوا هەموو شتێك لەدەست دەدەیت. تەنانەت خودی خۆتا!

مامۆستا. دوای وتەکانت یەکسەر دەستنوێژم هەلگرت، هەستم دەکرد لەگەڵ هەموو دلۆپە ئاوێکدا کە لە دەستو ڕووخسارم دەهاتنەخوار، وەکو باڵندەیەکی سپی بەرەو لای هەورە سپییەکان لە شەقەی باڵم دەدا......

لەگەڵ ڕاخستنی بەرماڵەکەمو سەدای «الله أكبر» دا هەموو گیانم وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی، دەستم کرد بە گریانێکی قوڵ، یەکەمجارم بوو هەست بە لەززەتو خۆشییەکی ئاوها بکەم، ئەوسا زانیم چی "مەحبوبێکم" هەیە، منی بەندەی بچووك چی "مەعبود"ێکم هەیە!!

ئەو کاتە زانیم کە هەموو مەحەببەتەکان ئەگەر لەم "مەحبوب"ەوە سەرچاوە وەرنەگرن، هەمووی تەفرەدانو سەرابن!

گەیشتن بە خۆشەویستی خودایی، گەیشتنە بە دەریای سازگاری ئەوین، دوای زەمەنێك لە تینوێتیو بێ هیوا بوون لە بیابانی وشکەڵانی ژیاندا!

ئەو ئێوارەیە لەگەڵ گریانەکەی مندا پرۆشەی بارانێکی هێمن دایکرد، هەستم دەکرد ئاسمانیش لەگەڵ مندا دەگری!

مامۆستاکەم: تۆ فێرت کردم کە بزانم، لەززەتو خۆشی لە قاقای پێکەنینو سەمای غەفڵەتدا نییە!

تۆ فێرت کردم بە فرمێسکەکانم، داستانی خۆشەویستیم تۆمار بکەمو هەست بە خۆشیو لەززەتێك بکەم، کە هەموو خۆشییەکانی دونیا، ناتوانن بۆم دەستەبەرکەن!

ئازیزم: ئاوێتە بوون بە خۆشەویستی خودایی بەهەشتێکە نەبڕاوە، ئەو بەهەشتەیە کە پێشینان دەڵێن: هەرکەسێ لە دنیادا نەچێتە نێوی، بەهەشتی ئاخیرەتیش نابینێت!

چوون هەر نازانێ بەهەشت چییە، تا هەوڵی بۆ بدات!

ئێمە هێشتا لە کەناری ئەو دەریای ئەوینەداین، ئاوا هەستێکمان هەس! جا ئەگەر نوقمی ئەو دەریایەبین دەبێت لە خۆشییاندا چی بکەین؟

بە کابرایەکی ئەعرابییان گوت: کابرا، دەزانی نرخی یەك کولێرە بووە بە یەك دینار، ئەی هاوار چی بکەین؟

دەزانی چی گوت؟! گوتی: وەخودا خەمم نییە، ئەگەر گەنمیش دەنکی ببێتە یەك دینار!

من خودا دەپەرستم، وەکو ئەوەی کە فەرمانی پێکردووم، ئەویش ڕزقی من دەدا هەروەکو چۆن بەڵێنی پێداوم! ئیتر خەمی چیم هەبێت؟!

تەماشا چی تێگەیشتنێکی بەرزە! گەیشتۆتە چی پلەیەکی بڵند، چەند بە جوانی لە مانای «عبودية» تێگەیشتووە. گەیشتووە بە چی سەعادەتێك، کەسێك ئاوها بیر بکاتەوە، ئیتر هەرگیز خەم ڕێگای دڵی ئەو نادۆزێتەوە!

ئەم کابرایە کە "ئەعرابی"یەکی هەژارو نەخوێندەوارە، بەڵام زانایە بە خودا!

زانست ئەوە نییە کە شتەکان بناسی! زانیارییەکان بزانی! بەڵکو زانستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بە تەواوی مانا بیچێژی، هەستی پێ بکەیت!

تەماشاکردنی پشکۆ لە دوورەوە لە نێو ئاگردانەکەدا، هەنگوین لە شانەکەیدا، خۆ عیلمو زانست نییە!!

حەکیمێك دەڵێت: بەرزیو بڵندیو نرمیو شکستی تۆ، بە پێی نزیکیتە

لە خۆشەویستەکەت، ئەگەر لە زینداندا بیت لە نێو چاڵێکی قوڵدا، بەڵام نزیــك بیت لە "مەحبوب"ەکەت گرنــگ نییە، چونکە تۆ بەو نزیکییەت لە کەشکەشانی ئاسمانیت!

وەلــێ ئەگەر دووربوویت لە "مەحبوب"ت با لە ئاســمانیش بیت، تۆ لە "ئەسفەلەســافیلین"دایت، چونکە ئەوەی چاوی لە خۆشەویستی خۆی بێت، ئیتر کەس نابینێت!

خۆشەویســتەکەت بەهەشــتی تۆیە، بەوەوە تۆ هەمیشە لە بەهەشتا دەژیت، دووری ئەویش دۆزەخە!

ئەوەی لە خۆشەویســتی خۆی نزیــك بێت، ئیتر خەمی هیچی نییە! هیچــی کــەم نییە، هەموو ســەروەتو ســامانی دونیا هی ئــەوە! بەڵام بــە بێ لوتفــی ئەو "محبوب"ە هەموو ســەروەتو ســامانی دنیا وەهەمو خەیاڵاتە، کەواتە بە شوێن پلەو پایەدا مەگەڕێ، هەوڵدە تەنها سەرنجی "محبوب"ەکەت بۆ لای خۆت کەمەندکێش بکەی!!

لە "عابد"ێکیان پرسی: حاڵت چۆنە؟

گوتی: زۆر باشــم لەم دنیایەدا هەموو شــتێك بە دڵی منە، هەڵاتنی خۆر، ئاوابوونی، هەڵاتنی مانگو ئەســتێرەکان، خۆشی، نەخۆشی، ژیان، مردن، هەر هەمووی!

- چۆن هەموو شتێ بە دڵی تۆیە!؟

- هەموو ئەم شتانە بە ویستی پەروەردگار ڕوودەدەن لەم بونەوەرەدا، بەبێ فەرمانو ویستی خودا هیچ کارێك ڕوونادا، منیش ڕازیم بە ویستو فەرمانــی خودا، ئەوەی ئــەو دەیەوێت منیش هەر ئەوەم دەوێت، کەواتە هەموو دونیا بە دڵی منە!!

سەیرە! چی ئاستێکی بەرز، چی ژیریو فامێکی کامڵ، چی دڵێك؟!

نازیـــزم، ئەگەر ئێمە ئاوا تەســلیم بە خودا بین، ئیدی چۆن ژیانمان نابێت بە بەهەشتی خودایی؟!

ئیدی چۆن خودا هەموو تکاو نزایەکمان پەسەند ناکات؟!

ئیدی چۆن لەوپەڕی دڵنیاییو ئاسودەییدا ژیان بەسەر نابەین!؟

پێم خۆشبوو سەبارەت بە نوێژو موناجاتی ئیلاهی بۆت بدوێم، وەلێ ئەم کارەم دواخســت، چونکە ســەرەتا پێویســتە بە ماریفەتێکی قوڵ بۆ خودا ناسین بڕوانین.

پشــکۆکە بخەینە نێو مشــتمان، ئەو کات تەواو بە گڕ ئاشــنا دەبین، هەنگوینەکە تامکەین، ئەو کات دەزانین شیرینی یانی چی؟!!

ئێمە پێویستە دووبارە لە دایك بینەوە، بگەڕێینەوە قۆناغی منداڵیمان، ئەو کاتەی لاپەڕەی تەمەنمان وەکو کڵۆ بەفر سپی بوو!

بەڵام بۆ ئەو دووبارە لە دایکبوونە دەبێت لە ناری ئەوینا بتوێینەوە، تــا لــە قوڵایی شــتەکان حاڵــی دەبین، تــا دەزانین ئەویــن یانی چی؟! بەندایەتــی یانــی چی، تا لەو پێنــاوەدا ئامادەبین هەمــوو قوربانییەك بدەین، لە دڕكو داڵی ڕێگا چێژ وەربگرین، شــەیدا بین بە مانای وشــە!! تێبگەین بە تەواوی تێگەیشــتن! نەك هەر کۆمەڵە قسـانێك بکەین کە خۆشمان نازانین چی دەڵێین!

یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێ: وەڵامی چوارکەس لە ناخەوە هەژاندمی! یەکەمیان، پیاوێکی خراپ بوو، کاتێك بەلامدا تێپەڕی، جلوبەرگەکانم کۆکردەوە، تا نەهێڵم جلەکانیم بەربکەوێ!

گوتی: یا شێخ خودا خۆی دەزانێ، سبەی ڕۆژ حاڵی منو تۆ چۆن دەبێ!

دووەم، کابرایەکی مەستم دی کە شەراب مەستی کردبوو، هەلدەستاو بەر زەوی دەکەوت، پێم گوت، کابرا هەنگاوی پتەو هەلبگرە با نەکەوی!
پێــی گوتم، ئەری تۆ بەو هەموو لــە خۆ ڕازیبونەتەوە هەنگاوەکانت پتەون؟!

ســێیەم، منداڵێك بوو، چرایەکی بەدەســتەوە بوو، لێم پرســی: ئەو ڕووناکییەت لە کوێوە هێنا؟

ئەویش فوویەکی لە چراکە کردو گوتی: تۆ کە شێخی ئەم شارەی پێم نالێی ئەو ڕوناکییە کێوە چوو؟!

چوارەمیان ئافرەتێکی زۆر جوان بوو، کە لەوپەڕی تورەییدا ســکاڵای لە هاوســەرەکەی دەکرد، پێم گوت: ســەرەتا، ڕووخسارت داپۆشە، پاشان لەگەڵم بدوێ!

پێی گوتم: من نوقمی شاوەتو ئارەزووی دونیاییم، بە شێوەیەك وەها لە خۆم بێ ئاگام، کە ئاگام لە خودی خۆم نییە!

ئەدی تۆ چۆن نوقمی عەشقی خوداییتو لە نەزەری منیش دەترسی؟!

دەبــا بەو ڕۆحەوە خۆمان بۆ ژووانی ئەوینی خودایی ئامادەکەین، تا بزانیــن چی دەکەینو چی دەڵێین، چی داوا دەکەین، زاناترین کەســیش ئەو کەسەیە کە خودای ناسیوە!

ئادابی بەندایەتی فێربووە!

بە خودای گەورەت دەسپێرم، ئەزیزم.........

هەر لە منداڵیمەوە دیمەنی خۆراوابوون سەرنجم ڕادەکێشێت، ئەو دیمەنە ئاشنایە بە ڕۆحم، دەبینم وەکو ئەویندارێکی شەرمن، بە ڕەنگی زەردو سیمای پڕ حوزنو ماتەمەوە ماڵاوایی لە ئەویندارەکەی دەکات.

ماڵاوایی‌و جودایی تەزوو بە ڕۆحی مرۆڤدا دێنن، لە ناخەوە دەیهەژێنن! ئەگەر ئومێدی دیدار نەمایە ئێمە نەماندەتوانی ساتێك بژین..

مامۆستا گیان، گەیشتنی نامەکەت سرووەی شەماڵێك بوو، ئارامی بەخشی بە ڕۆحم، دوای ئەوەی توند لە ئامێزم گرت بە تاسەوە چوومە نێو دەریای وشە جوانەکانت:- "زانست ئەوە نییە کە شتەکان بناسی! زانیارییەکان بزانی! بەڵکو زانستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بە تەواوی مانا بیچێژی، هەستی پێ بکەیت!!"

ئازیزم، ئەو چێژ وەرگرتنەیە وادەکات ئێمە ئاوێتەی ئەوینی خودایی بینو ئاوێزانی مەحەببەتێك بین کە نەتوانین چرکەیەك دەستبەرداری بین.

یەکێك لە پێشینان فەرمووی: "چەندە هەژارو داماون ئەهلی دونیا، دنیا بەجێدێڵنو هێشتا تامی خۆشترین لەزەتی دنیایان نەکردووە!

لێیان پرسی خۆشترین لەزەتی دونیا چییە؟

گوتی: خۆشەویستی‌و هۆگری خوداو، شەوقو تاسەی دیداری ئەوو چێژ وەرگرتن لە زیکرو پەرستشی ئەو پەروەردگارە گەورەیە!

دەبا ئێمەش بەو حیرمانەوە ماڵاوایی لە دنیا نەکەین! لە خۆشترین

لەزەتی ئەم دنیایە بێ بەهرە نەبین!

بۆچی تا ئێستا لەزەتی موناجاتو خوشوعو نزیکی لە خودامان تاقی نەکردۆتەوە؟!

ئێمەیەك کە هەمیشە بە شوێن لەزەتە وەهمییەکاندا وێڵو سەرگەردانین، بۆچی لەم لەزەتو خۆشییە حەقیقیە بێئاگاین؟!

بۆ کەسێك کە ئەوینی خودا هەمیشە بەهاری دڵی بێت، گوڵزاری ڕازاوەی سەرفرازیو سەعادەتی بێت، چی لەو ساتانە خۆشترە کە لە نوێژدا بە خزمەتی ئەوینداری گەورەی خۆی بگاتو، لەوێدا سکاڵای دەردی دووریو تاسەی بیرکردنو گڕی ئەوینی خۆی بکاتو بە فرمێسکی ڕژاوو بە دڵی شکاوەوە تێکەڵ بە موناجاتی ئیلاهی ببێتو دەردی دڵی خۆی بۆ خوداوەند بکاتەوە.

ئازیزم دڵ بێ ئەو ئەوینە لاشەیەکی بێ گیانە، خۆشەویستی خودا نووری دڵانو شیفای دەردانە، ئەو خۆشیەیە کە هەرکەسێك وەدەستی نەهێنێت، ئەوا هەموو ژیانی دەبێتە خەمو ئازارو ماڵوێرانی.....

کەواتە یەکەمین هەنگاو بۆ گەیشتن بە "خشووع" بە ڕۆحی "نوێژ" ئەوەیە کە تۆ بە هەموو لاشەت بە ڕۆحو گیانت بە دڵو دەرونت بە سۆمای چاوەکانت ڕوو بکەیتە خودا، کاتێك کە نیەتت هێناو دەستی بەندایەتیت بڵندکردو، دواتر لەسەر سینەت داتنانو، قولاپی چاوەکانت لە شوێنی سوژدەکەت گیرکرد، ئیتر هەموو شتێکت لە یاد دەچێت!

دەبێت دڵ خاڵی بێت لە هەموو شتێ، جگە لە یادی خودا، چونکە پەرداخی پڕ، ئیتر هیچی دی ناگرێت!

کاتێـــك مرۆڤ دەزانێت هەموو دنیا، هەموو ویســـتو ئارەزووەکان، هەمـــوو هیـــواو ئاواتەکان، وا لە ژێر فەرمانی خـــودادان، ئیتر دڵی بۆ دەداتە غەیری خودا!؟

حەســـەنی بەســـری دەڵێت: وریابـــە ئەگەی لە نوێـــژدا، خوداوەند تەماشـــای تۆ بکات، بەڵام تۆ تەماشـــای کەســـێکی تر بکەیت، دڵت بە شوێنێکی ترەوە بەندبێت!!

ئەگەی داوای بەهەشـــتو پارێـــزگاری لە دۆزەخی لێ بکەیت، بەڵام دڵت غافڵو بێ ئاگابێت و نازانی چی دەڵێیت بە زوبانت!!

ئـــای دەبێت ئێمە لـــە نوێژەکانماندا چەند بێ ئـــاگا بوبین؟چەند بەرامبەر ئەوســـاتە نوورانیانە، کەمتەرخەم بووبین کە پەروەردگار لە بەرامبەرماندا وەستاوەو، ئەگەر هەر داوایەکمان کردبا گیرا دەبوو؟!

جێگای داخو ئەسەفە کە عومرێك ڕابوردووە، بێ گەیشتن بە لەزەتی خشوع، لەزەتی نزاو پاڕانەوەو موناجاتو، عەرزی سکاڵاو دەردی دڵ بۆ خوداوەندی گەورە، بۆ گەورەترین خۆشەویست!

ئازیزم: دوای هەموو نوێژێك خەم دامدەگرێت، لە دوای سلاّودانەوە بیرم دەکەوێتەوە من لە کوێ بووم، لە جێ ژووان لەگەڵ مەحبوبەکەی خۆمدا، ئەی بۆ نەمزانی قسە بکەم، بۆ نەمزانی لەگەڵ خوداوەندا بدوێم، چۆن دەبێت ئەویندار لە کاتی ژووانکردن لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بێ ئاگابێ لە تێپەڕبوونی کات؟! هەرەساتە خۆشەکانی ژیانی بە غەفلەتو بێ ئاگایی بە ڕێ کات..

خواناســـان دەڵێن: کۆتایی هێنان بـــە نوێژ بە ماڵاوایی کردن نییە،

بەلکو بە سلاوە، چونکە خوداوەند نایەوێت، مالاوایی لێ بکەیت، بەلکو دەیەوێت دووبارە سلاوی لێ بکەیتەوەو بگەڕێیتەوە بۆ لای!!

ئەو خودا میهرەبانە ئێمەی خۆشــدەوێت.. ڕۆژانە "پێنج" جار ژووانی دیدارو لیقا بۆ خۆشەویستانی ساز دەکات..!!

چی خۆشەویســتێك ڕۆژانە (٥)جــار بەرامبەر خۆشەویســتەکەی دەوەســتێت، تا بە ئارەزووی خۆی قســەی دڵی بدرکێنێت، ئەســرینی چاوی بڕێژێت، دەردی دڵی خۆی هەڵبڕێژێ؟!

ئازیزم، خودا بە ڕاستی خۆشیدەوێین!

زۆربەی عاشقەکان بە مەعشوقەکانی خۆیان دەڵێن: خۆشم دەوێیت، چونکە پێویســتم پێتە، تۆ بۆ من پێویســتی! لەبەر خودی خۆیانەو بەس!!

بەلام خودا ئێمەی خۆشــدەوێت، چونکە دەزانێت ئێمە پێویستمان پێیەتی، وەلێ خۆ ئەو هیچ پێویستی بە ئێمە نییە!!

ئــەو پــەروەردگارە گەورەیە لــە نوێژدا ڕووی لە خۆشەویســتانی وەرناگێڕێ، عەجەب ئێمە ڕووی دڵمان بەلای کێدا وەردەچەرخێنین؟!

ئێمە بێ ئەو خودایە داماوین، خۆ ئەگەر مولکی سولەیمانو هێزی موســاو عومری نوحو جوانی یوســفمان هەبێت، وەلــێ بەندەی خودا نەبین، لەگەڵ خودا نەبین، خۆشەویســتی خــودا نەبین، ئەوا هەموو ئەمانە سودێکیان بۆمان نییە!

ئێمە کاتێك هەست بە تەواوی ئازادیی خۆمان دەکەین، کە دەبینە بەندەو کۆیلەی خوداوەنــد، بە تەواوی بەندایەتی بەندەی خودا بین،

ئەوکات پادشـــای دنیاین، دونیا لە بری ئەوەی فریومان بدات، دەبێتە نۆکەرمان!

پاشـــایەك بـــەلای کۆیلەیەکـــی خۆیدا ڕابـــوورد، کۆیلەکـــە لەبەری هەڵنەسا!

پاشا گوتی: بۆ لەبەرم هەڵناسی، ئەی نازانی من پادشای تۆم؟

کۆیلەکە گوتی: قوربان بۆچی لەبەرت هەڵسم، لە کاتێکدا کۆیلەکانی من پادشای تۆن!!

پاشا بەسەر سوڕمانەوە پرسی چۆن؟!

کۆیلەکە گوتی: دونیاو لەزەتو شاوەتو ئارەزووەکانی کۆیلەی منن، بەڵام پاشای تۆنو تۆش کۆیلەی ئەوانی!!

ئەبوبەکـــری کوڕی عەیاش دەفەرموێت: لـــە خەومدا دونیام بینی لە شـــێوەی پیرێژنێکی پیری ناشـــیرینو سەرسپیدا چەپڵەی لێ دەداو خەڵکیش بە دەوریدا ســـەمایان دەکرد، کاتێك گەیشتە لای من، گوتی: ئەگەر دەستم بتگاتێ چیم لە مان کردووە ئاواش لە تۆ دەکەم!!

پاشان ئەبوبەکر دەستی کرد بە گریان!!

کەواتـــە ئێمە لە نوێـــژدا خودی خۆمان دەکڕینـــەوە، مرۆڤایەتیو ئازادی خۆمان وەدەست دێنین!

وەگەرنا دەبینە کۆیلەی ئەڵقە لەگوێی دنیاو زەلکاوی ئارەزووەکانی!

لێرەدا دەگەیتە ڕازی ئەوینی پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) کـــە دەیفەرمـــوو «وجُعِلَتْ قُـرةُ عَينـي في الصَّلاة» ئەگەر نوێـــژ نەبا بەچی بگەیشتینایە بە ژووانی ئەوینی خوداوەند؟! ڕازو نیازی خۆشەویستیو

ئەوینمان چۆن دەدرکاند؟!

بۆیە شاعیر دەڵێت:

كُلُّ جُهدي لَيسَ يُجدي إن أكُن يا رَبُّ وَحدي

كُلُّ أفراحِ حَياتي كُلُّ أحزاني وَ سَهدي

وَ سُكوني و شُجوني و اضطِرابي حينَ تَعدي

وَصَلاتي وَحياتي وَمَماتي يَوم لَحدي

كُلُّ فِكرٍ كُلُّ شِعرٍ كُلُّ بَوحٍ كانَ عندي

كُلُّ هَذا يا إلهي ساجِدٌ مُذ قُلتَ عَبدي

گەیشتن بە نوێژێك کە خودا پێی ڕازییە، بەخشوعێك کە دڵ تیایدا دەگاتە لوتکەی سەعادەت، ئاواتی هەموو باوەڕدارێکی ڕاستەقینەو ئەویندارێکی حەقیقیە!

جا بۆ ئەوەی بە تەواوی مانا بچینە نێو کڕنوشی سوژدەی دڵ، بۆ ئەوەی هەموو بە یەك دڵ، ڕووەو قیبلەی ئیلاهی لەگەڵ سەداو زایەڵەی (الله أكبر)دا نوێژی دڵ دابەستینو لە مەداریجی بەندایەتیدا بەرەو مەلەکوتی ئەعلا هەڵکشێین دەچینە نێو گوڵستانی خشووعو ڕێگاکانی چوون بەرەو گلێنەی چاو!

پرسیار لە خوداناسێك کرا: ئەرێ دڵیش سوژدە دەبات؟

گوتی: بەڵێ بەڵام سوژدەیەك کە تا قیامەت سەری هەڵنەبڕێت!!

بە ئومێدی دیدار، بە خودای میهرەبانت دەسپێرم، خوداوەند سەلامو فەڕو بەرەکەتی خۆیت بەسەردا ببارێنێت!!




# نامەی هەژدەیەم

ماموٚســتاگیان بە گەیشــتنی نامەکانت تینوێتی ڕوٚحم دەشــکێت، جارێکی دی لەم زەمەنە ســەختەدا دەچمە نێو ژیانێکی ئەفســوناوی، دەشــێ من بێ چرپەی وشــەکانت، دەستی نەرمی پەیڤەکانت، سرووەی فێنکی هەستی پڕ ئەوینت، چیم کردبا؟!

ماموٚستا، نامەی پێشوت تەزووی بە ڕوٚحمدا هێنا، بوٚ یەکەمجار لە مانای بەرزی نوێژو موناجاتی خودایی گەیشــتم، ئێستا کاتێك دەچمە سەر بەرماڵ خەریکم دەبمە دلوٚپێك ئاو!

ئەی هاوار من بەرامبەر کێ ڕاوەستاوم؟ مـــن لەگەڵ کێ دەدوێم؛ مـــن لـــەوەو پێش کە دەمگوت: خودام خۆشـــدەوێت، بە تـــەواوی مانا نەمدەزانی دەڵێم چی، ئێســـتا دەزانم ئەوەی من دەیکەم هیچ لایق بە جوانیو گەورەیی خودا نییە! وەکو شاعیر دەڵێت:

واەزانی لوتکەی ئەوینە عەشقم لەوەی من زیاتر کەس پێی نەزانی
کاتێ بینیمو ڕوانیمە جوانی هەموو عەشقی خۆم بە گاڵتە زانی

ئازیزم: ئێمە ئانمان دەوێت وەلێ بێ دەردو، وەردەگرین بەڵام بێ بەخشین، دەمانەوێت خۆشەویست بین، وەلێ بێ خۆشەویستی، ئەمەش مەحاڵە!!

"فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ" دەبێت شەیدابین وەکو شەیدابوونی تینو بۆ ئاو، دەزانی یادم بکەن یادتان دەکەم، یانی چی؟!

چەنـــد جـــار ئێمە ئەم ئایەتەمـــان خوێندۆتەوە، بەڵام هێشـــتا لە گەورەیی ئەم بەڵێنەی خودا، بە تاوی هەست، ئیحساسمان پێ نەکردووە، یادکردن بێ خۆشەویســـتی نابێت، مرۆڤ کاتێك یادی کەسێك دەکات، هەمیشـــە لەبـــەر نیگای لاناچێو ناتوانێت فەرامۆشـــی بـــکات چونکە ئەوینی ئەو دڵو دەروونی داگیرکردووە.

هەمیشـــە بە خەیاڵ لەگەڵی دەدوێ، قســـەی بۆ دەکات، بە تاســـەی دیدارێتی، بەو یادەوە دەژی، بێ ئەو یادە ناتوانێت ساتێك ئۆقرە بگرێ، بە بیســـتنی ناوی دڵی دادەخورپێ، بە بیســـتنی دەنگێك کە لە دەنگی ئەو دەچێت ڕادەچڵەکێ، هەندێجار لائیرادی بانگی دەکات.

«ولله المَثَلُ الأعلى» ئەویندارى خودا بێ وێنەتر لە هەموو ئەویندارێك لە یادی خوداوەندی خۆی ســـاتێك بێ ئاگا نابێت، بەو یادەوە شـــادە،

دڵارامە، سەکینەی خودایی دادەبەزێتە سەر ڕۆحی!

ئەوساش دەزانیت چی ڕوودەدات؟

خودای گەورەو میهرەبان لە ئاسمان یادت دەکات، ناوت دەبات.

خودای گەورە ناوی منی بەندە، ناوی منی بچووک دەبات؟

بەڵێ: خۆشـــی دەوێیت! یادت دەکات، ڕێزت لێ دەگرێت، میهرت پێ دەبەخشـێت! بە تاسەی دیداری ئەبەدیتە! «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ» لە نێو کۆڕو مەجلیسی فریشتەکاندا باس باسی تۆیە!

خوداوەند بە جبریل دەفەرموێت: جبریل ئەو بەندەیەم خۆشدەوێت، تۆش خۆشـــت بووێت، تۆ دەبیتە خۆشەویستی خودا، جبریل بانگەواز دەکات لە نێو هەموو فریشتەکانی ئاسماندا، خودا فلانە بەندەی خۆی خۆشدەوێت، ئێوەش خۆشتان بوێ!

چۆنیان خۆشناوێت، مەگەر تۆ خۆشەویستی، خۆشەویستی گەورەیان نیت!؟

پاشــان فریشتەکان دێنە ســەر زەوی‌و بە پەیامی خۆشەویستی تۆ دڵەکان گوڵاو پرژێن دەکەن، ئەو کات دڵە سپییەکان شەیدات دەبن!

ئەمە ئەو ئەوینە نەمرەیە کە لەسەر عەرشەوە دابەزیوە بۆ زەوی!

خودایە زیکری تۆ ئێمە دەگەیەنێت بە چی ئاستێك، ئێمە بە تۆوە چەند گەورەین، چەند بەهێزین، چەند ئاسودەین!

ئــەو کاتــەی کــە دەگریــت خوداوەنــد دەڵێــت: ئــەوە دەنگــی خۆشەویستەکەی منە؟!

ئــەو کاتەی دەپاڕێیتــەوە خوداوەند دەڵێت: ئــەوە نزاو پاڕانەوەی خۆشەویستەکەی منە؟!



ئـــەو کاتـــەی داوا دەکەیت خـــودا هێنـــدەی خۆشـــدەوێیتو نازت دەکێشێت، دڵت ناشکێنێ، بەڵام وریابە خوداوند تەماشای ڕووخسارت ناکات، تەماشـــای کاڵای ئاڵاووالات ناکات، تەماشـــای نێـــو دڵت دەکات، ســـەرنجی کردەوەکانت دەدات! پەیامبەر دەفەرموێت: «رُبَّ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ»

واتە: دەکرێت بەندەیەکی پرچ ئاڵۆزاو، هەژارێکی تۆزاوی، جل دڕاو، لە دەرگایان دەرکراوو، پێشوازی لێ نەکراو، بەڵام ئەگەر سوێند بەخوا بخـــواو داوای شـــتێك بکات بڵێ: خودایە هەر دەمەوێت، خودا قســـەی ناشکێنێو سوێندەکەی بۆ جێبەجێ دەکات!

کەواتـــە گرنـــگ ئەوەیە بگەین بە خودا، پەلە بکەین بۆ گەیشـــتن بـــە ئـــەو، چونکە کاتێـــك دەگەین بە ئـــەو ئیتر دەگەیـــن بە هەموو ئاواتەکانمان، گەیشتن بە ئەو واتە گەیشتن بە هەموو شت، دووری لە ئەو، واتە سوڕانەوە لە بازنەیەکی بەتاڵدا، واتە: هیچ!!

ئێمە مەتاعەکانی سەرەڕێ ڕێبەندمانن، ناهێڵن زوو بگەین بە خودا، بەڵام کاتێك دەگەینە ئەو خوداوەندە گەورەیە، ئیتر داواکاریمان نامێنێ جگە لە بەهەشت، ئیتر داوای مەتاعە مردووەکانی دونیا ناکەین!

شێخولئیسلام ئیبنو تەیمیمە دەفەرموێت: باوکم بۆی گێڕامەوە لە محي الدینی نەحاسەوە کە لە خەودا شێخ عبدالقادری گەیلانی بینیوە فەرمویەتی: خودا دەفەرموێت: «مَنْ جَاءَنَا تَلَقَّيْنَاهُ مِنَ الْبَعِيدِ وَمَنْ تَصَرَّفَ بِحَوْلِنَا أَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ وَمَنْ اتَّبَعَ مُرَادَنَا أَرَدْنَا مَا يُرِيدُ وَمَنْ تَرَكَ مِنْ أَجْلِنَا أَعْطَيْنَاهُ فَوْقَ الْمَزِيدِ»

واتە: «ئەوەی بێ بۆلای ئێمە، ئێمە لە دووری ڕا پێشوازی لێدەکەین،

ئەوەی پشت بە ئێمە ببەستێ‌و تەوەککولی بە ئێمە بێ، ئاسنی بۆ نەرم دەکەین! ئەوەی ملکەچی ویستو ئیرادەی ئێمە بێت، ئێمەش ئەوەمان دەوێــت کە ئەو دەیەوێت، واتــە ئەوەی داوا بکات پێی دەدەین، ئەوەی لەبەر ئێمەو لە ترسی ئێمە واز لە شتێك بهێنێت کە ئێمە قەدەغەمان کردووە لەسەری، ئێمە بە حەڵاڵی لەوەی زۆر زێتر پێدەبەخشین!

ئەمــەش مەقاماتــی بــەرزی بەندایەتین: "مەقامــی بەندایەتــی‌و عبودییەت، مەقامی ئیســتیعانەو تەوەککــول، مەقامی تاعەتو ملکەچ بوون، مەقامی سەبرو ئارامگرتن لەسەر حەرام..

ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی «خودا لێی ڕازی بێت» دەفەرموێت: بە ڕۆژ خزمەتی پێغەمبەری خودام (ﷺ) دەکرد، کە شەویش دەهات لەبــەردەم دەرگای پێغەمبەری نازدار دەمامەوە، تا ئەو کاتەی ماندوو دەبــووم‌و خــەو دەیبردمەوە، دەمبیســت پێغەمبەری خــودا دەیگوت «سُبحانَ اللهِ، سُبحانَ اللهِ، سُبحانَ ربِّي»

ڕۆژێك فەرمووی «ڕەبیعە چی داوا دەکەی داوایکە تا پێتی ببەخشم»

پێم گوت: مۆڵەتم بدە با بیر بکەمەوە، دواتر بیرم کردەوە کە ئەم دنیایە فانییەو دەبڕێتەوە!

داوای چی بکەم، لەم دنیا فانیەدا هەموو شتێك فانییە!

گوتم: پێغەمبەری خودا داوات لێدەکەم، کە لە خوداوەند بپاڕێیتەوە لە دۆزەخ ڕزگارم بکاتو بەهەشتم پێ ببەخشێ، داوا دەکەم لە بەهەشت هاوڕێی تۆبم، تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ).

پەیامبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچی دیت ناوێت؟

گوتم، نا ئەوەیەو بەس!!

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "باشە، ئەم کارەت بۆ دەکەم، تۆش بۆ گەیشتن بەو ئاواتە بە سوژدەبردن بۆ خودا هاوکاریم بکە"

ئازیزم، چونکە نزیکترین ســاتەکانی بەندە لە خوداوە ئەو کاتەیە کە سەری لە سوژدەدایە!

ســەیرە کاتێك ئەویندار لە خۆشەویســتی خۆی نزیــك دەبێتەوە هەرگیــز حەزناکات لێــی دوورکەوێتــەوە، ئەی بۆچــی ئێمە پەلەی ئەوەمانە کە سەرمان لە سوژدە بڵندکەین؟

ئەی بۆچی دەمانەوێت خێرا جێ ژووان جێبهێڵین؟

لە کاتێکدا پەیامبەرمان دەفەرموێت: "کاتێك یەکێك لە ئێوە نوێژ دەکات، ئەوە موناجات لەگــەڵ پەروەردگاری خۆیدا دەکات، با بزانێت چۆن موناجات دەکات".

ئیبنو مەسعودیش دەفەرموێت: "تا تۆ لە نوێژدا بیتو سکاڵای حاڵی خۆت بکەی، ئەوا تۆ لە دەرگای پاشــای گەورە دەدەیت، هەرکەسێکیش لە دەرگای پاشا بدات بۆی دەکرێتەوە".

ســەرفرازی بــۆ ئەو کەســەی دەگاتە لەززەتــی موناجاتی ئیلاهی، دەزانێت لەگەڵ کێدا گفتوگۆ دەکات، خودای خۆی ناسیوەو لە خزمەتیدا خۆشترین ساتەکانی ژیانی بەسەردەبات!

یەکێــك لە پێشــینان دەفەرموێت: لە ســەفەردا بووین لە پاپۆڕدا، ڕەشــەبا ناچاری کردیــن ڕووبکەینە دوورگەیەك لــەوێ کابرایەکمان بینی، بتی دەپەرست، کاتێك زانی ئێمە هیچمان بتپەرست نین، پرسی:

ئەی ئێوە چی دەپەرستن؟ گوتمان، «الله» گوتی «الله» کێیە؟ گوتمان، ئەوەی کە عەرشەکەی لە ئاسمانە!

گوتی: ئەمەتان چۆن زانی؟

گوتمان: پەیامبەری بۆ ناردین بە موعجیزاتی ئاشکرا!

گوتی: پێغەمبەرەکەتان چی لێهات؟

گوتمان: دوای ئەوەی پەیامی خودای گەورەی گەیاند، کۆچی دوایی کرد لەم دنیایە.

گوتی: چی بە جێهێشتووە؟

گوتمان کتێبی خودا "قورئانی" بەجێهێشتووە.

گوتی: پیشانمەدەن؟ ئێمەش قورئانمان بۆ هێنا.

گوتی: نازانم بیخوێنمەوە، چەند ئایەتێکمان بۆ خوێندەوە.

دەستیکرد بە گریانو فرمێسك بەسەر ڕوومەتیدا هاتنە خوارێو گوتی: ئەوەی خاوەنی ئەم وتە شیرینانە بێت، شایانی ئەوەیە هەرگیز سەرپێچی فەرمانەکانی نەکرێت. پاشان باوەڕی هێناو موسوڵمان بوو!

پاشان لەگەڵ خۆماندا لە پاپۆڕەکە هەڵمان گرتو چەند سورەتێکی قورئانیشمان فێرکرد!

کاتێك شەو داهاتو هەرکەسەو چووە سەر جێگای خۆی بۆ ئەوەی بنوون، گوتی: ئەرێ ئەو کەسەی ئێوە بە منتان ناساندو منتان بۆلای ڕێنمایی کرد، دەخەوێت؟

گوتمان: نا ئەو هەرگیز نەخەوی لێدەکەوێتو نە خەوە نوچکێ ئەو «حيٌّ قيُّومٌ»ە.



گوتی: بەڕاستی بێ ئەدەبیە، کۆیلە لەبەردەستی گەورەکەی خۆیدا بخەوێت، پاشان ڕاپەڕی‌و بە گریانەوە تا بەرەبەیان خەریکی شەو نوێژو موناجات بوو!

کاتێك گەیشتینە شاری "عەببادان" لە ئێران، بڕێك پارەمان بۆ کۆکردەوە، گوتی: ئەمە چییە؟

گوتمان: خەرجیەکە، بۆ گوزەرانی خۆتی سەرف بکە.

گوتی: سُبحانَ الله، ئێوە منتان بۆ ڕێگایەك ڕێنمایی کرد، کە خۆتان هێشتا ئەو ڕێگایەتان نەناسیوە، من لەو دوورگەیەدا خودام نەدەپەرستو بتم دەپەرست، بەڵام ئەو فەرامۆشی نەکردووم‌و ڕزقی دەدام، ئێستا کە من تەنها ئەو دەپەرستم‌و بەندەی ئەوم، ئەویش بەدیهێنەرو ڕۆزیدەرە، ئیدی چۆن فەرامۆشم دەکات؟! پاشان بەجێیهێشتین!

خاوەنی ئەم بەسەرهاتە دەڵێت: پاشان زانیم بە سەختی نەخۆشەو لە کاتی سەرەمەرگدایە، چووم بۆلای‌و دڵنەوایی‌م کردو پێم گوت: هیچ داواکاریت نییە؟

گوتی: ئەو کەسەی کە ئێوەی هێنا بۆ دوورگەکە «مەبەستی خودا بوو» هەموو داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ کردووم!

کاتێك لای ئەو گەڕامەوە، نیوەڕۆ خەوم لێکەوت، لە خەومدا لە یەکێك لە گۆڕستانەکانی عەببادان بووم، باخچەو گوڵزارێکی ڕازاوەم بینی، کۆشکێکی بچکۆلەی تێدابوو، بە جوانترین شێوە ڕازێنرابووەوە کەنیزەکێکی لێبوو، پێی گوتم: توخوا زوو بەڕێی بکەن چاوەڕوانیم بۆ دیداری ئەو زۆر درێژەی کێشا!

که له خه‌وه‌که‌م وه‌خه‌به‌رهاتم‌و چووم بۆلای، بینیم کۆچی دوایی کردبوو!

دووباره شه‌و له خه‌ومدا بینیم له هه‌مان شوێن‌و له‌گه‌ڵ هه‌مان که‌نیزه‌کداو ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌خوێند «سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ»

ئازیزم: یه‌کێك له گه‌وره‌ترین هۆکاره‌کانی گه‌یشتن به خشوع‌و له‌زه‌تی نوێژ ئه‌وه‌یه که وا بزانیت ئه‌و نوێژه‌ت کۆتا نوێژه‌و ئیتر له‌وه‌ودوا ماڵاوایی ده‌که‌یت!

هه‌میشه ئه‌ویندار‌ه‌کان به یه‌کدی ده‌ڵێن: تۆ بڵێی جارێکی تر به دیداری یه‌کتر شاد بین، خۆزگه بۆ ساتێکی تر بۆ ته‌نها چرکه‌یه‌ك یه‌کترمان ده‌بینی‌و گفتوگۆمان ده‌کرد، هه‌ندێجار ده‌ڵێن: خۆزگه له ژیانمدا جارێکی تر تۆم دیبا، ئیتر بشمردبام قه‌یناکات!

پێغه‌مبه‌ری ئازیزیش ده‌فه‌رموێت: «إذا قُمْتَ في صلاتِكَ فَصَلِّ صَلاةَ مُوَدِّعٍ»

کاتێك له نوێژدا ده‌وه‌ستیت وا بزانه ئیتر ئه‌مه نوێژی ماڵاواییه، ئیتر دواجاره ده‌چیته سه‌ر به‌رماڵ‌و ده‌ستی نزاو پاڕانه‌وه بڵند ده‌که‌یت! ده فرمێسکه‌کانت بوه‌رێنه، بگری، له گوناهه‌کانت په‌شیمان به‌ره‌وه، داوای لێخۆشبوون بکه، کێ ده‌ڵێت ئه‌مه دوا نوێژت نابێت‌و ماڵاوایی له‌م دنیا فانیه ناکه‌یت!؟




# نامەی نۆزدەیەم

ئازیــزم کاتێك ئەم نامەیەت پێ دەگات، لــە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانــی پیرۆزدایت، میوانە خۆشەیســتەکەت هێــدی هێدی خۆی کۆدەکاتــەوەو ماڵاواییــت لێــدەکات، لە ســاتە بێوێنەکانی عەشــری ئەواخیردایــت، ئاوێتــەی پیتە زیوینەکانی قورئانیــت، ڕۆژانە لەگەڵ خوێندنەوەی پەیامی ئاســماندا، ئەسرینەکانت بەسەر ڕوومەتتا دێنە

خواریّو بەرۆکت تەڕ دەکەن!

ئەو شــەوو ڕۆژانەی کۆتایی ڕەمەزان، خۆشترین یادگاری هەمیشە زیندووی ژیانی خۆشەویستانی خودان!

دانیشتنی سەر خوانی ئێواران، ژوانی بێدارانی شەو، چاوەڕوانکردنی وەختی نزوولی ئیلاهی، موناجات لێل خوداوەند، دیمەنگەلێکن هەرگیز لەبەرچاو ون نابن!

چ ساتێکی عەجیببە، چی ئەوینێکی نەمرە، ئەو کاتەی دڵەکان نۆقرە ناگــرن، چــاوەکان ناتوانن پێڵوەکانیان لێك بنێن! جێی نووســتن جێ دەهێڵن، دەســتەونەزەر دوای ئەوەی بە ئاوی مەنگی شەو، ڕوخساریان بە دەســنوێژی مەحەببــەت مونەوەر دەکەن، دەچنە نێو ڤیســتیڤاڵی ڕۆح، ئیتــر کەســیان لەبیر نامێنێــت، تەنها ئەو کەســانە نەبێت کە دەستیانگرتن بەرەو نوور!

ئەوە ســاتەکانی سەحەرە، دەنگو سەداو زایەڵەی « یا ربّ، یا ربّ»ی موســتەغفیرینی ئەسحارە، گریانە، هەنســکە، نزایە، ناڵەیە، چرپەیە، نازە، ڕەجایە، هاواری بەسۆزو ئەوینی ئەحبابی خودایە!

ئازیزم زوننونی میســری لە وەســفی ئەو بەندانەدا دەڵێت: « گەر کاتێك یەکێك لەوان ببینیت، کاتێك هەڵساوە بۆ نوێژو لە میحرابەکەیدا ڕاوەســتاوەو دەستی بە خوێندنەوەی وتەی پەوەردگاری گەورەی خۆی کردووە، ئەو کاتە وەهای دێ بە خەیاڵدا، کە ئەو ڕاوەستانە، ڕاوەستانی



ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی هەموو لە حزووری خودای گەورەدا هەڵساونەتە سەر پێ، ئەو کاتە خەریکە دڵی لە تاواندا لە قەفەزەی سینگی دێتە دەرێو ئەقڵو ئاوەزی لێ دەتۆرێ!!

بە حاتەمی ئەصەمیان گوت: چۆنە ئاوها بە خوشوعەوە نوێژ دەکەیت؟

گوتی: کاتێك بۆ دابەستنی نوێژ «الله أكبر» دەکەم، بە خەیاڵ «کابە» دێنمە پێش چاوی خۆم، پردی سیراتیش ژێر پێم، بەهەشت لە لای ڕاست دادەنێمو دۆزەخیش لەلای چەپم، فریشتەی ڕۆحکێشانیش لە دواوەم، وا هەست دەکەم پێغەمبەری نازداریش لە نوێژەکەم ڕادەمێنێت، پێم وایە ئەو نوێژەشم دوانوێژە لەم دنیایەدا!

هەر بۆیە زۆر بە تەعزیمەوە «الله أكبر» دەکەم، بەجوانیو وردبوونەوەوە قورئان دەخوێنم، بەو پەڕی ملکەچیو شەرمەوە دەچمە کڕنووشو سوژدە، لەنێوان خەوفو ڕەجادا نوێژ دەکەم، پاشان کاتێك سلاو دەدەمەوە دڵنیا نیمو نازانم کە نوێژم گیرا بووە یان نا!!

ئێمە بە کۆڵێك تاوانو گوناهەوە، دەچینە بەرامبەر خودایەکی گەورە کە هێندەی ژمارەی دڵۆپەکانی باران نیعمەتی بەسەردا ڕژاندووینو ئێمەش لەبری سوپاسو ستایش، سەرپێچی فەرمانەکانیمان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا... «سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ»!!

ئەو پەروەردگارە میهرەبانە هەرکاتێك بەندەیەکی حەمدو سەنای بکات، ئەو دەیبیسیو بیسەری وتەکانێتی.!

ئای خودایە، چەند مەزنە، تۆ دوعاکانم دەبیسی؟ نزاو پارانەوەم دەزنەفی؟ ئاگات لە فرمێسکەکانی منە؟! دەردی دڵم دەزانیو بە گوناهی خۆم لەگەڵ ناکەی؟ وەسڵی خۆت نابچڕێنیو بە دەردی هیجران نامسووتێنی؟ خودایە من خەجاڵەتم، شەرمەندەم، بە چی زمانێك سوپاست بکەمو بە چی دڵێك کڕنووشت بۆ بەرم؟

یەکێك لە ساڵحان کاتێك شەوان دەچووە ژوانی ئیلاهی ئاوها دەستی بە حەمدو سەنای خودا دەکرد:

خودا من بچکۆلە بووم، تۆ پەروەردەت کردم، ستایش بۆ تۆ!

من لاواز بووم، تۆ بەهێزت کردم، سوپاس بۆ تۆ!

من هەژاربووم، تۆ دەوڵەمەندت کردم، سوپاس بۆ تۆ!

من گەداو بێکەس بووم، تۆ لانەی ئارامیت پێ بەخشیم، سوپاس بۆ تۆ!

من بێ هاودەمو هاوسەر بووم، تۆ پێت بەخشیم..سوپاس بۆ تۆ!

من برسی بووم. تۆ تێرت کردم

من ڕووتو ڕەجاڵ بووم، تۆ پۆشتەت کردم...حەمدو سەنا بۆ تۆ!

من ڕێبوارێکی تەنها بووم، تۆ هاودەمیت کردم، ستایش بۆ تۆ!

من نامۆ بووم، تۆ ئاشنات کردم، سوپاس بۆ تۆ!

من پیادە بووم، تۆ هەڵتگرتمو هاوکاریت کردم،

حەمدو سەنا بۆ تۆ!

خودایــە، ئێمەی هەزار لــەم بیابانی ژیانە جەنجاڵــەدا، لوتفی تۆ ئەبوا، لەنێو ترکوناڵی چی دۆڵێکی بێناودا، پەلەقاژەمان دەکرد!؟
ئێستا بە لوتفی خۆت، ئێمەت نوقمی دەریای میهری خۆت کردووەو لە ســایەی نووری هیدایەتدا، لە نێو گوڵزارێکی نیمچە بەهەشــتا ژین بەسەر دەبەین!هەر بۆیە مەحوی دەڵێت:

دەمــێ بــە ویســعەتی کــورســی کــەرەمــکــە پــێــم ئــەی ڕەب
زوبــانــی پــێــوە ڕوابــێ بــە قــەد هــەمــوو کــەوکــەب
بــە عــومــری نــوحــەوە تــەوفــیــقــی تــۆ بــکــا ئــیــمــداد
لــە بــەحــری شــوکــرەوە یــەك قــەتــرە بێنمە ســەر لــەب

واتە: خودا زارێکم پێببەخشــی فراون بێت هێندەی کورسی خۆت کە لەســەروی ئاسمانە، ئەو زارەی کە گەورەیی هێندەی کورسییە بە ژمارەی ئەســتێرەکانی ئاســمان زمانی لێ ڕوابێت، هاوکات بە عومری نووحەوە تەوفیقو یارمەتیم بدەی بۆئەوەی ئەوسا بتوانم لە دەریای سوپاســگوزاری بۆ تۆ، یەك دڵۆپە بهێنمە سەر لێوم!؟ چونکە سوپاسی تۆ ئەی پەروەردگار بە ئێمە ناکرێت!

هەر بۆیــە پێغەمبەری نازدار دەیفەرمــوو: « رَبَّنا وَلَــكَ الْحَمْدُ؛ مِلْءُ السَّمَاوَاتِ وَمِلْءُ الأَرْضِ وَمِلْءُ مَا بَيْنَهُما وَمِلْءُ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ ، أَهْلُ الثَّنَاءِ وَالمَجْدِ»
ئازیزم کاتێك دەســت دەکەیت بە خوێندنەوەی «الحمد لله رب العالمين» بزانە کە هیچ کەســێك شــایانی ئەوە نییە لە حزووریدا بە تەعزیمو

ئەقدیسەوە ڕابوەستی، جگەلە پەروەردگاری هەموو جیهانەکان!

ئــەو پــەروەردگارە گەورەیەی کەجڵەوی هەمــوو کارەکانی ئێمەی بەدەســتە! هەرچــی هەمانەو هەرچــی چاوەڕوانیشــی دەکەین، تەنها خەڵات و عەتای بێسنووری ئەو زاتە گەورەیەیە!

ڕزقو ڕۆزی، ژینو مردن، دینو دنیا، هێزو دەوڵەت، پارەو سەروەت،ماڵو منداڵ، خۆشیو شادی، سەعادەت و کامەرانی.. هەموو بەدەستی ئەون!

ئیتــر دەبێت دڵنیاییو ئارامییــەك ببێتە میوانی دڵە بێگەردەکەت کە هیچ ڕەشەباو زریانو وەیشوومەیەکی ئەم زەمانە دژوارە، نەتوانێت ئەو ئارامییە بشێوێنێت!!

دەزانــی تــۆ لەگەڵ کێــدا هاتوویتــە گفتوگۆ؟! بەرامبــەر بە کێ دەدوێیت؟!

« إلـهُ الأوَّلينَ والآخِرين» خــودای ئەووەڵو ئاخری هەمــوو بەندەکان، ڕاخەری زەویو ڕاگری ئاسمان، ئیتر خەم لە چی دەخۆیت؟

سەیرە وەکو یەکێك لە ساڵحان دەفەرموێت: «يا رَبِّ عَجِبتُ لِمَنْ يَعرِفُكَ، كيفَ يَرجُو غَيرَكَ؟ وَعَجِبتُ لِمن يَعرِفُكَ، كَيفَ يستَعِينُ بغَيرِكَ؟

پەوەردگار، سەرم سوڕماوە لەوەی تۆ دەناسێو داوا لە کەسێکی دی دەکات، تۆ دەناسێو پشت بە کەسێکی تر دەبەستێو داوای یارمەتی لە کەسێکی تر دەکات!؟

لەوێدا ئیتر هەموو خەمەکان دەڕەوێنەوە، هەموو کەسەکان لەبیر

دەچن، ئەوێ باوەشی سۆزی ئیلاهییە، لەوێدا دڵنیا دەبین ئیدی باوەش نییە ئارامیمان پێ ببەخشێت!!

لە ژێر سێبەری ڕەزامەندی خوداو میهرو لوتفی ئەودا ئیتر تاڵییەکان دەبنە هەنگوین!

فَلَيتَكَ تحلو والحَياةُ مَريرَةٌ وليتَكَ ترضى والأنامُ غِضابُ

وَلَيتَ الَّذي بَيني وَبَينَكَ عامِرٌ وَبَيني وَبَينَ العالَمينَ خَرابُ

إذا نِلتُ مِنكَ الوُدَّ فالكُلُّ هَيِّنٌ وَكُلُّ الَّذي فَوقَ التُرابِ تُرابُ

واتە:

بەس تۆم شیرین بیو ژیانم ژەهری مار

تۆ لێم ڕازی بیو تووڕەبێت هەزار

نێوان منو تۆ خۆشبێو ئاوەدان

ئیتر گوێ نادەم بە هەموو جیهان

تۆ خۆشەویستیت بە من ببەخشی

چاوم لە هەموو خەڵکی ئەپۆشی

ئەوەی لەسەر گڵ دێتو دەڕوانێ

خۆراکی گڵە بە خۆی نازانێ

وەلێ ئازیزم دەبێت بزانین چی دەڵێین....

کە بە «مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ» ئاشنا بووین، ئیدی بزانین «إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ» یانی چی؟

چونکە وەکو مەحوی دەڵێت:

لە دڵدا خەڵق‌و خوا بوو، فائیدەی چی

کە دەم پڕ بێت لە «إیاك» و «إیاك»؟!

واتــە: کــە دڵمان پڕ بێت لە باســی ئەم‌و ئەوو پەیوەســتبوون بە خەڵقــی خوداوە، ئیتر ســوودی چییە دەممان پــڕ بێت لە «إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ»

چونکــە ئەوەی گەورەیــی‌و عەزەمەتی خودا دڵــی داگیر کردبێت، ئیدی گەورەیی کەسێکی دی لە دڵیدا جێگای نابێتەوە!

ئیدی جگە لە گەورەیی خودا هەســت بە هیچ شــتێکی دی ناکات، ئیتــر ئاوڕ بۆ لای کەســێکی تر ناداتــەوە، ڕووی دیــدەو دڵی دەکاتە سوژدەگاهی خۆی‌و تێکەڵ بە بەحری نوور دەبێت...!

خۆزگە بەو ساتە نوورینانە، خۆشبەختی بۆ ئەویندارانی حەقیقی، پاکــی بۆ جەماڵی پڕکەماڵــی ئەو ڕوخســارە نوورینانەی بە چرپەی «اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ»، هەســت بــە جریوەی ڕۆحیــان دەکەیت، کە بەرەو عەرشی کردگار دەفڕێت!!




# نامەی بیستەم

مامۆســتاگیان نامەکەی تۆ، لە کاتێکی باشدا گەیشت، ئەو کات من گرفتاری نەخۆشــی بووم، بــە تەنێ لە ژوورەکــەم ڕا، ماتو بێدەنگ ئاســمانی خەیاڵم تەی دەکرد، گەیشــتنی نامەکەت وەکو ســروەیەکی فێنك دڵە خەمبارەکەی خۆشحاڵ کردم، بۆنی گوڵاوی وشەکانت هەموو ژوورەکەی داگیر کرد!

بە دەسـت خـۆم نەبوو، ویـڕای ئازاریکی زۆر هەمـوو برینەکانم فەرامۆش کردو هەستامە سەرپێ، هەروەکو خۆت تەشریفت هێنابێت، وەها دەستەو نەزەر هاتمە خزمەتی قاصید!

ئازارەکانـم لەبیرچـوون، خەمەکانم هەموو ڕەوینـەوە، وتەکانت سـارێژکەری ئێش‌و برین‌و ئازارەکانی منن، ئەو چەند ڕۆژەش کە بە دەستی ئێش‌و ئازارەوە دەتلامەوە، هەمیشە دەنگی هێمن‌و پڕ خرۆشی جەنابت وەکو دەستێکی نەرم ڕۆحی گرتبوومە باوەش!

دەتگـوت ئازیزەکەم: خودا هەمیشـە بەندە خۆشەویسـتەکانی خۆی بەسـەردەکاتەوە، بە شـاوەت‌و ئارەزووە کاتییەکانی دونیا غافڵیان ناکات، تـا لـە ناکاو بە مردن غافلگیربـن‌و بە ڕوو زەردی دونیـا جێبهێڵن.......

نا، ئازیزم خوداوەند خۆشەویسـتانی خۆی بە نەخۆشـی‌و ئازار موبەتەلا دەکات، تا بە تەواوی ئاوێتەی ئەوینی ئیلاهی ببن!

خوداوەند تۆی لە بیربووە، بۆیە لە نێو هەزاراندا تۆی خەڵاتکردووە، تا بەسەبرو ئارامگرتن، بە شوکرو سەناکردن، بە سوپاس‌و ستایشکردن، پلەی بەرزت بداتێ‌و لە ڕیزی ئەولیا بەرزەکانیدا ناوت بەرێ!

تا تۆی بەندە ئەلطاف‌و میهری بێ سنووری بە چاوی خۆت ببینی، تا بزانی هەر خۆی دەردو بەڵا دەنێرێ‌و هەرخۆشی شیفا دەبەخشێ!

تـا بـۆ چەند سـاتێك لەگەڵ خـودی خۆتدا لـە خەڵوەتدا بیت‌و بیربکەیتـەوە! لێپرسـینەوە لەگـەڵ خۆتـدا بکەیت، چیـت کردووە لەوەوپێش، ئەی ئێستا چی دەکەیت؟

لـە کارەکانـت ڕازیـت، ئامادەی سـەفەری بۆ لای خودا؟ نـەی ئەگەر لە نەخۆشخانەوە بەرەو گۆڕستان براباى، ئێستا لە کوێ دەبوویت؟

ئازیزم، نەخۆشی، کوشندەترین نەخۆشی، چارەسەر دەکات، بەڵای غەفلەت!

ئای چ دەردێکی کوشـندەیە، کاتێك مرۆڤ غەفلەت سـۆمای چاوی لێڵ دەکاتو بەسـەرو بەسیرەتی لێدەستێنێ، ئیدی هیچ نابینێتو لە هەموو شتێك بێ ئاگا دەبێت!

لە شـەوە زەنگی غەفلەتدا پەلەقاژێ دەکاتو درك بە هیچ ناکاتو تەنانـەت خـودی خۆشـی فەرامـۆش دەکات، لە هەموو سـەعادەتو کامەرانییەك مەحروم دەبێت!

هەمیشـە لـە عەزابـدا دەژی! نەخـودی خۆی دەناسـێت، نەزاتی خوداوەنـد، بە تاقـی تەنێ لـە گێژەلۆکەی نەهامەتیـدا ژیانی کولە مەرگی دەگوزەرێنێ!

ئەمـە وێڕای عەزابی سـەختی خودایی لە دۆزەخـدا، کە ئەمیان گەورەی هەموو بەڵاکانە!

لێـرەدا بەرامبەر لوتفی خودا لە شـەرما پێڵـوی چاوەکانمان لێك دەنێین!

لە هەیبەتی خوداوەند ئاونگی شـەرمەزاری بە ڕووخسارماندا دێتە خـوارێ، ئاخـر ئێمەی بەنـدەی بچکۆلە، لە مەملەکەتی بێسـنووری خوداییدا چین؟!

وەختێـك بیر لە گەورەیی‌و عەزەمەتـی خوداوەند دەکەینەوە، کە هەموو شتەکان، جڵەوی هەموو کارەکان، لە ژێر کافو نونی ئەو دان!

ئێمەش لاوازو هەژارو کەساس‌و بێ دەسەڵات! هەمیشە چاوەڕوانی کەرەمی ئەوین! هەربۆیە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دەفەرموێت: (اللَّهُمَّ لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ)..

خودایە هیچ پەناو ڕزگارییەك نییە، جگە لە پەنای تۆ!

پیرەمێردی شاعیر دەڵێت:

تەنها خوایەکەی زەوی‌و ئاسمان
لە هەموو شوێنێك پەیدایت‌و پەنهان
لە بەندەگیدا بەوە سەربەرزم
کە لە دیوانی تۆدا ئەلەرزم
ئامان چەند خۆشە کە ڕادەوەستم
جار جارە بۆ تۆ نوێژ دادەبەستم
(ئەلحەمد) دەخوێنم ڕوو لە تۆ دەکەم
بە غائیبانە حەمدت بۆ ئەکەم
کە گەییمە ئەوەی بڵێم: (إیاك)
بە نەشئەی حزور دڵم ڕووناکە
چونکە ئەو دەمە وام لە حزورا
دڵم خۆی ئەشوا لە دەریای نوورا
بە ئەندامێکی پڕ گوناهەوە
بۆ نوێژ ئەچینە ڕیزی شاهەوە
من کە لیقای تۆم هەرزان دەستکەوێ
لە بوردەبازی بەندە چیم ئەوێ

(خـــوایـــە) وام لــێ بـکـە ئـاگـام لـە خـــۆم بێ
کــە وتـــم، (الــلــە) هـــەر لــەگــەڵ تـــۆم بێ
ئــــــەوەك بــــە زووبـــــــان دوعـــــا بـخـوێـنـم
لــــە دڵـــــدا ڕەگـــــی خـــەڵـکـی دەربـێـنـــم
بـــە ڕەزامــــــەنـــــدی دڵـــــم پـــڕ جـــــۆش بێ
هــەرچــی تــۆ بـیـکـەی ئــــەوەم لا خـــۆش بێ
کـــە هـــەرچـیــت کـــــردو بـــە چـاکـــم زانـــی
دەســـتـــم مـــاچ دەکــــــات خـــۆشـــگـــوزەرانـــی
ئـــەگــــەر شـیـّـتـــی بـــێ شـیـّـتـــی تـــــەواو شـیـّـت
خـــــاکو خــــــارو زیـــــخ ئــــەکــــەونــــە بـــەرپـــێـت

بەندایەتـــی بۆ خـــودا ئەوەیە، کە جگە لە (اللـــە) بەندایەتی بۆ کەس ئەنجام نەدەی، لەو نەبێ لە هیچ کەســـی دی نەپاڕێیتەوە، تەنها ملکەچی سوڵتانی ئەو بیت، تەنها فەرمانی ئەو جێبەجێ بکەیت، تەنها بە شەریعەتی خودا کاربکەیت، ژیانو مردنت تەنها بۆ خودا بێت!

ژیانت هەمووی جێبەجێکردنی فەرمانی خودا بێت!

خۆشەویستیو ڕقت تەنها لەبەر خودا بێت، تەبەڕڕا بیت لە شیرکو ئەهلی شیرك.

بۆئەوەی هەســـت بە لەززەتی بەندایەتی بکەیت، دەبێت تەســـلیمی خودا بیت، خۆشەویســـتی ئەو خودایە بخەیتە پێش هەموو شـــاوەتو ئارەزوو لەزەتێکی دونیا، تا چێژ لە بەندایەتیت بۆ خودا وەربگریت!

دڵ بێ ئەوینی خودایی لاشەیەکی بێ ڕۆحە، ئەو ئەوینە نوورو دەرمانی

دڵانە، ئەو لەززەتە گەورەییە کە هەر کەسێك وەدەستی نەهێنێت، ئەوە ژیانی هەمووی دەبێتە ئازارو ئەشکەنجەو کولە مەرگی!

ئیبنو تەیمییە دەڵێت: گەردیلەیەکی ئەم لەززەتە چیایەك لە لەززەتەکانی دونیای ناگاتێ، هەربۆیە گەردیلەیەك لە ئیمان بە خوداو پێغەمبەر، مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ، لانەی ئەشکەنجەو ئازارو عەزاب، ڕزگار دەکات!

چاوەکانت دابخە ئازیزم، بۆ ساتێك بیر بکەرەوە، بزانە بەندایەتی بۆ خودا چ نیعمەتێکی گەورەیە، جوانترین شت لەم دونیایەدا ئەوەیە کە تۆ بەندەی خودا بیتو دڵێکی ئاوەدانت هەبێت، بە زیکرو خۆشەویستی خودا!

هەستدەکەیت بە تەواوی شعور کە خودایەکت هەیە پشتی پێدەبەستی، داوای یارمەتی لێدەکەیت، کارەکانت بۆ ئاسان دەکات، جڵەوی هەموو کارەکانی تۆی بە دەستە، نزاکانت قبوڵ دەکات، بە مێهرو ئەوینەوە چاودێریت دەکات.

مالِي وَمَا لِلأَغنِياءِ وأَنتَ … يا رَبِّ الغَنِيِ وَلا يُحَدُّ غناكا

مالِي وَمَا لِلأقوِياءِ وأنتَ … يا رَبِّي وَرَبَّ النّاسِ ما أقواكا

مالِي وأبوابَ المُلوكِ وأنتَ مَن … خَلَقَ المُلوكَ وَقَسَّمَ الأملاكا

إنّي أوَيتُ لِكُلِّ مأوىً في الحياةِ … فَما رَأيتُ أعَزَّ مِن مأواكا

وتَلمَّستْ نَفسي السَّبيلَ إلى النجاةِ … فَلَم تَجِدْ مَنجىً سِوَى مَنجاكا

وبَحَثتُ عَن سِرِّ السَّعادةِ جاهِداً … فَوَجَدتُ هذا السِّرَّ في تَقواكا

فَليَرضَ عَنّي النّاسُ أو فَليَسخَطُوا … أنا لَم أعُدْ أسعَى لِغَيرِ رِضاكا

أدعـــوك يا ربّـي لتـغفر حوبـتـي ... وتعينني وتـمدّني بهداك

فـاقـبلْ دُعائي واستجب لرجاوتـي ... ما خـاب يـوماً من دعا ورجاك

خودایـــە، بۆ چـاوم لە دەوڵەمەندی دەوڵەمەندانـــی دونیا بێت، لە کاتێکدا دەوڵەمەندی تۆ بێ سنوورەو کەس لە تۆ دەوڵمەندتر نییە!

بـــۆ لـــە هێزی خـــاوەن هێزەکان بترســـم، لە کاتێکدا کـــەس لە تۆ بەهێزتر نییە! بۆ بچمە بەردەگای پاشایان، لە کاتێکدا تۆ بەدیهێنەری هەموو پاشایانی، هەر تۆش موڵكو دەسەڵاتت پێبەخشیون!

زۆر پەناو لانە گەڕام لە ژیانمدا، بەڵام خودایە هیچ پەناو لانەیەکم لە پەناو لانەی تۆ بەرزو بەڕێزتر نەبینی!

زۆر ڕێـــگام تاقیکردەوە بۆ ڕزگاربوون، بەڵام هیچ ڕێگایەك ڕزگاری تێدا نەبوو، جگە لە ڕێگاکەی تۆ!

زۆر گـــەڕام وەدووی نهێنی بەختەوەریدا، بەڵام ئەو نهێنییەم تەنها لە (تقوی)ی تۆدا دۆزییەوە!

ئیـــدی خـــودا گیـــان خەڵکی لێم زیـــز دەبن، یان لێـــم ڕازی دەبن، بەلامەوە گرنگ نییە، من تەنها هەوڵی ڕازیبوونی تۆ دەدەم!

خودایـــە لێت دەپاڕێمـــەوە، لە گوناهەکانم خۆشـــبیت، گرفتەکانم چارەســـەرکەیت، خەمو پەژارەم نەهێڵیت، یارمەتیم بدەیت، هیدایەتم بدەیتو ڕێگای ڕاستم نیشان بدەیت.

خـــودا گیـــان دوعام قبـــوڵ بکە، تـــکاو ڕەجام وەرگـــرە، چونکە تۆ هەمیشـــە کەسێك نائومێد ناکەیت کە دەســـتی نزاو دوعای بۆ لای تۆ بلند کردبێت!




# نامەی بیست و یەک

ئێوارە بوو خەریکبوو خۆر لەکەل ئاوادەبوو، کزەبایەکی ساردی دەهـات بە ژێـر درەختەکاندا ڕووەو مـاڵ دەگەڕامەوە، ئەم بەرو ئەوبەری ڕێ، گەڵای زەرد داپپۆشـیبوو، لەگەڵ کزەی باکەشدا پۆل پۆل گەڵاکان دەوەرینە سەر ڕێگاکە.

کاتێك بەسەر گەڵا زەردەکاندا دەڕۆیشتم خشەی گەڵاکانم وەکو گزەی دەروونێکی بریندار دەهاتە بەرگوێ. دیمەنی خەزانو ڕەنگی زەردی درەختەکانو گزەی ساردی با، ببوون بە سروودێکی خەمناكو سیمایەکی سامناکیان بە ژیان دەبەخشی! لە ناخەوە دەیهەژاندم، سەمفۆنیای فەنای بۆ ئەم دونیا بێ بەقایە دەچڕی!

هێدی هێدی پێش ئەوەی دنیا بە تەواوی تاریك دابێت، گەیشتمە ماڵێ، ئەویش بۆنی پاییزی گرتبوو، کش‌ومات لە پڕ دەنگی بانگی ئێوارە پەردەی بێدەنگی دڕی!

دڵەکانی ڕاچڵەکاند.. ڕۆحەکانی وەخەبەرهێنا.. هێشتا جل‌وبەرگی قوتابخانەکەم دانەنابوو کە دیتم نامەکەی جەنابت لەسەر مێزەکەم دانرابوو!

چەند تامەزرۆ بووم، چەند بە تاسەی وشەکانت بووم.. بیرم دەکردی مامۆستا گیان!

بیرکردنێکی بێ سنوور!

دوای ئەوەی دەستنوێژم هەڵگرتو بە دڵێکی خۆشەوە نوێژی شێوانم ئەداکردو تەواوێك دوعای خێرم بۆ کردی.. نامەکەی بەڕێزتانم کردەوە...

ئازیزم، دەزانم تۆ مرۆڤێکی هەستیاری، لە وردو درشتی دەوروبەرت ڕادەمێنی، ژیرو دانشمەندی بەرامبەر هەموو ڕووداوو دیاردەیەکی گەردوون، ڕادەوەستیو بیردەکەیتەوە!

هەمیشە مرۆڤە هەستیارو دەروونپاكو دڵناسکەکان بەرامبەر

بە وەرزی پاییز سام دەیانگرێت! ماتو بێدەنگ دەبن، ئەوان پێش هەورەکان دەگرین!

لە پرسـەدان بۆ گەڵای وەریو، بۆ ڕەنگی زەردی گوڵستان، بۆ گەڵاڕێزانی باخ! بۆ هەناسەی ساردی ناخ، بۆ وەرزی کۆچ!

دەبینن ئەم دونیایە چەند سـەیرە، ڕۆژگار چۆن دێتو دەچێ، پاییز گـەڵای دارەکانو تەمەنیش قژی مرۆڤەکان دەداتە دەسـت خەزان!

دەزانن ڕۆژێك دەبێت بە یەکجاری ماڵاوایی لەم دونیایە بکەین!

هەرچەندە کە عومری خزرو جامی جەمت بوو

چونکە ئەمەلت زۆرە، چ عومرێکی کەمت بوو! «نالی»

دونیـا جگە لە سـەرابێکی فریـودەر، جوانییەکـی نێو کلۆر، لەزەتێکی فانی، چیدی نییە!

ئیمامی شافیعی دەڵێت:

إنَّ للهِ عِـبَـادًا فُـطَـنَـا    طَلَّقُوا الدُّنيَا وخَافُوا الفِتَنَا

نَظَروا فيهَا فَلَمَّا عَلِمُوا    أَنَّهَا لَيْسَتْ لِحَيٍّ وَطَنَا

جَعَلُوها لُجَّةً واتَّخَذُوا    صَالِحَ الأَعمَالِ فيها سُفُنا

خوداوەند بەندە گەلێکی ژیری هەن کە لە ترسی فیتنەو تەڵەکەی دونیـا، دونیایان وەلانا، ئەوان تەماشـایان کـرد بینیان ئەم دونیایە زێدو نیشتمانی هیچ زیندوویەك نییەو دەبێت هەمووان جێیبهێڵن!

هەربۆیـە دونیایان کـردە دەریاو کرداری باشـی خۆیان کردە

بەلەمی ڕزگاربوون!

هەربۆیە ئازیزم لە ڕۆژی دواییدا خۆشەویستانی خودا حەسرەتی هەموو هەناسەیەك دەكێشن كە بۆ خودایان هەڵنەمژیوە!

هەناســەیەك دوور لە خودا حەسرەتە، ئەی عومرێك دوور لە خودایی؟!

هەموو دەزانین كە دونیا فانییە، هاكا بەڕەی تەمەن پێچرایەوە، ناومــان لە نێو زیندووواندا ســڕایەوە، ئەی كــوا خلودی ئەبەدیو نەعیمی ئەبەدی بەهەشت!

لــە كام جێ بۆ ســەعادەت بگەڕێین، لە كاتێكــدا لەبەردەرگای عبودییەتدا نەبێت مەحاڵە!

ئێمــە گیرۆدەین، گیرۆدەی نەفســی خۆمان، ئەو نەفســەی كە ســەرچاوەی هەموو خراپەكارییەكە ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي﴾ یوسف: ٥٣ كەواتە هەر خێرێك لە خودی ئێمەدا هەبێت ئەوە لوتفو میهری خودایە!

تــا ئێمەش بە تــەواوی بەنــدەی خودابیــن، خوداوەند زێتر یارمەتیمان دەداتو بەســەر نەفسو شــەیتانا زاڵمــان دەكات كە سەرچاوەی هەموو خراپەیەكن!

خودا بەندەی خۆی فەرامۆش ناكات، دەستبەرداری نابێت!

وەلێ كام بەندە؟ ئەو بەندەیەی كە بە تەواوی پشتی بە خودا بەســتووە، ئەویش بە هەبوونی متمانەی تەواوو سپاردنی هەموو كارەكان بە ئەو!

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: خودایە من شەرم دەکەم بڵێم: «تَوَکَّلتُ عَلَیكَ»، چونکە گەر تەوەککولم لەسەر تۆبا، نەجگە لە تۆ لە کەس دەترسام، نەداواشم لە کەس دەکرد!

بەندەیەك خوداوەند هەمیشە چاودێری دەکات، کە لەزەتی "عبودیة"ی چێشتبێ، بەڵام شەقیقی بەڵخی دەڵێت: هەرکەسێ سکاڵا بۆ غەیری خودا بکات، هەرگیز هەست بە لەززەتی عیبادەت ناکا لە دڵیدا.

ئازیزم گوناهو تاوان دڵی ڕەشکردوین، بینایی لێڵ کردووین، هەربۆیە چاومان بێ ئەسرینو دڵمان ڕەقو بێ هەستە، هەروەکو مەحوی دەڵێت:

خەیاڵی پووچی دونیا وا دەماغو دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فیکرم!

لە خودا داواکارم بە لوتفو میهرەبانی خۆی بمانبەخشێ، هێز بداتە بازووی خودا پەرستیمان دەروونمان بە نووری خۆی ڕووناكو بە مەحەببەتی خۆی ئاوەدان بکاتەوە، بە لەشکری ئەونەبێت ناتوانین بچین بە گژ نەفسو شەیتانا..

خودایە، ئێمە جگە لە تۆ پەروەردگارێکی دیمان نییە، تەنها چاوەڕوانی میهرو بەخشندەیی تۆین، لە دەرگای ڕەحمەتی خۆت دەرمانمەکەو دڵی ئێمەی بەندەی خۆت مەشکێنە، تۆ لە گوناهەکانی ئێمە گەورەتریو دەریای لێبوردنت لە بیابانی تاوانی ئێمە فراوانترە..

ئێمە وێڕای لاپەڕەی ڕەشی سەحیفەی پڕ گوناهمان، لە میهری تۆ هەرگیز بێ هیوا نابین ئەی هیواو ئومێدی بێ هیوایان!




# نامەی بیست و دوو




ئەمــەو ئێوارەی ڕۆژی عەرەفە بوو، دۆڵو دەشــتو کێوی پیرۆزی عەرەفە، بەرگی فریشــتەی پۆشــیبوو، میوانەکانی ماڵی خودا نوقمی دەریای زیو ببوون، دەتگوت بەفرباریوە!

دەشتو دەریای بە ڕەنگی سپی ئاودامان داپۆشیبوو...

دیمەنێکـی دڵڕفێن تەزووی بە ڕۆحمدا هێنـا، هاتبوون دڵەکانیان وەکو ئیحرامەکانیان سپی بکەنەوە، جارێکی تر ببنەوە منداڵێکی ساوا، لاپـەڕەی ڕەشـی تاوان بە بەفری ڕەحمەت بسـڕنەوە، بە فرمێسـکی پەشیمانی لێبوردنی ئیلاهی بەدەستبهێنن «مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»

دیمەنـی حاجیانـی ماڵی خودا لە عەرەفە لـە ناخەوە هەژاندمی، تەسـلیمی گریانێکـی قوڵ بووم، حـەزم دەکرد منیش لـەوێ بام، بۆ عیزەتی خودایی لەسەر خۆڵی دەشتی عەرەفە سوژدەم بردبا، بۆ ڕۆژانی ڕابردوو، عومری بابردوو فرمێسکی گەرمم هەڵوەراندبا، ئەوان هاوکات لە خۆشیو لەزەتێکدا دەژین کە سەرچاوەکەی سروەی بەهەشتە.

ئێستا ئەوان هەست بە بۆنو بەرامی جەنناتی عەدن دەکەن!

ئەوان گەیشـتوون بە ژووانی ڕۆح، هەموو مەتاعێکی دونیایان وەلا ناوەو بە درووودو سـروودی «لَبَّيْكَ اللَّهُـمَّ لَبَّيْكَ»ەوە هاتوونەتە حزوری ئەوینداری گەورەی خۆیان!

ئەوان ئێسـتا میوانی ئەو خۆشەویستەن کە عومرێکە دوعا دەکەن بە میوانی بن!

ئەوان لەوێدا بە پلیکانەی عبودیەتدا هێندە هەڵکشاون کە جگە لە چەتری ئاسمانی شین، هیچ دوورییەك لەگەڵ خوداوەندا وجودی نییە!

ئازیزم:

ئەوان گەیشتوون بە سەعادەتی ئەبەدی، شێخولئیسلام دەفەرموێ:

«مَن أرادَ السَّعادة الأبديَة فليلزم عتبة العُبوديَة» ئەوان پڕیاسکەی هەموو هیواو ئاواتەکانیان بە دەستی تڕاو چاوی بە ئەسـرینەوە بۆ خوداوەند واژ کردووە!

کەسـێك چێژی «عبودیَة»ی بۆ خودا چەشـتبێ، ئیدی ئەو خۆشیو سەعادەتە بە هەموو خۆشییەکانی دونیا ناگۆڕێتەوە!

ئەوان ئێستا بەچاوی حەقیقەت هەموو شتەکان دەبینن:

تَـأَمَّلْ فِـي الـوُجـودِ بَـعَـيْنِ فِـكـرٍ تَـرَى الـدُّنْـيـا الـدَّنـيـئَـةَ كَـالْـخَـيالِ

وَمَـن فِـيهـا جَـمـيعـاً سَـوفَ يَـفـنَـى وَيَـبـقَـى وَجـهُ رَبِّـكَ ذُو الْـجَـلالِ

هەرگیـز ناگەینە ڕازی عبودیەت بۆ خودا تا بە تەواوی حەقیقەت بە گەورەیی‌و عەزەمەتی خودا ئاشنا نەبین!

کاتێك تەماشای گەورەیی‌و میهرەبانی خودا دەکەین‌و گوناهو تاوان‌و تەقصیری خۆمان دەبینین ئەوسـا هەست بە منەت‌و فەزڵی گەورەیی خودا دەکەین!

نزیکی ئێمەش لە خودا بە پێی یادو زیکری ئێمەو خەریکبوونمانە بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی.

ئیبنولقەیـم دەفەرموێ: "ئەوەندەش بە خوداوە خەریکی، ئەوەندە لە خوداوەند نزیکی".

هەمیشـە ئەم وتەیـەت لەبیر بێت، کاتێك ئێمە مەسـتی دونیاین، ئیتر چۆن لافی ویلایەت‌و نزیکی لە خودا لێ دەدەین!

ئێمـە ئەو کات زۆر دوورین لە خودا... بۆیە دڵتەنگین، خەمبارین، نزاکانمان گیرا نابن، کێشـەکانمان چارەسـەر نابن، دوورین لە نووری

خودا، بۆیە لە شەوەزەنگا دەژین!!

گەر زانیبمان کە خودا هەمیشە چاودێرمانە، کاتەکانمان بەفیڕۆ نەدەدا!

چونکە پیاوچاکان دەڵێن: "ضِياعُ الوَقتِ يُطفِئُ نُورَ المُراقَبةِ"

کات بەفیڕۆدان نووری هەستکردن بە چاودێری ئیلاهی خامۆش دەکات.

دَقَّاتُ قَلبِ الْمرءِ قائِلَةٌ لَهُ     إنَّ الْحَياةَ دَقائِقُ وَثَوانِي

ترپەی دڵە پێمان دەڵێ بە جوانی ژیان خولەك‌و چرکە ساتە دەیزانی؟

گەر دەتەوێت بەرەو لای خوا بکەویتە ڕێ ئەوا یەکەم قۆناغی گەیشتن بە مەنزڵ ئیرادەو تاسەی گەیشتنە بە خودا، وەرچەرخانی دڵە بۆ لای ئەو، ڕووکردنە ڕووی پەروەردگارە!

بەڵام دەبێت ئەو دڵە لە زیندانی دونیاو شاوەت‌و ئارەزووەکانی ئازادکەین، بازاڕی پڕ زەرەرو کەسادی دونیا جێبهێڵین‌و ڕووبکەینە بازاڕی پڕ سودو قازانجی ئاخیرەت!

هاوار بۆ کەسێك باقی بە فانی‌و ئوخرا بە دونیا سەودا دەکا!

لە سوقی دەهردا دوکانی هەرکەس موددەتی عومرە

گەوهەر دانە پشکڵ دانە "مەحوی" مامەڵەی مەخلوق!

ئیدی بۆ دەبێت لە وەها مامەڵەیەکدا بەردەوام بین؟! بۆ تا تەمەن باقییەو داسی مەرگ دروێنەی نەکردووین، نەگەڕێینەوە بۆ لای خودا، خۆ وەنەبێت مردن پشووی تەمەن بێت خۆزگە وا دەبوو، بەڵام هاوار بۆ دوای مردن!

وَلَـو أنّـا إذا مِتْنـا تُـرِكْـنـا    لَـكـانَ الـمَـوْتُ راحَـةَ كُـلِّ حَـيٍّ
وَلَـكِـنّـا إذا مِـتْنـا بُـعِـثْـنـا    وَنُـسْـأَلُ بَـعْـدَ ذا عَـن كُـلِّ شَـيءٍ

واتە: ئەگەر بهاتبایە دوای مردن فەرامۆش کرابایین، ئەوە مردن بۆ هەموو زیندوویەك پشووی حەوانەوە دەبوو، بەڵام بەڵای گەورە ئەوەیە لـە دوای مردن زینـدوو دەکرێینەوەو لە هەموو کـردارو گوفتارێکی کردوومانە پرسیارمان لێ دەکرێت!!

کەواتە ئازیزم تاکەی ئێمە لە ڕێگای بەرەو لای خودا ساردو دوودڵ بین؟!

چونکە ئەوەی هیممەتی بەرەو پێشـچوونی نەبێت، ئەوا لە کاروان دوا دەکەوێتو لەوانەیە نەتوانێ هەرگیز پێیان بگاتەوە!

خۆشەویسـتیو ترسو تـکاش، بناغەی ڕێگای بـەرەو خواچوونە!

نەفسو شاوەتو ئارەزووی دنیاش، گەورەترین بەربەستەکانی ڕێن!

دەکرێـت ئێمە خۆمان بە خۆشەویسـتی خـودا بزانین، وەلێ ئەو ڕێگایە نەگرین کە لەومان نزیك دەکاتەوە؟!

ئێمـە بۆ هەموو تکاو داواو هیواو ئاواتو ئاتاجێکمان، کێمان هەیە جگە لە ئەو؟!

ئیدی دەبێت چی لە زیکرو یادی ئەو خۆشتر بێت، بەڵام بۆ کەسێك کە یادو زیکری خوا خۆراکی ڕۆحو گیانو ئەونو بێ ئەو خۆراکە ناژی؟

بۆ کەسـێك کە نەفسـی خۆی لەسـەر عیبادەت ڕاهێنا بێ زۆر لای سانایە شەوو ڕۆژ پێشبڕکێ بکا بۆ لای خوداو موسا ئاسا بڵێ ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾ طه: ٨٤ چونکە بەندە سـاڵحەکان دەزانن هەموو خۆشیو

کامەرانییەك لە ژێر سایەی فەرمانەکانی خودادایەو سەرچاوەی هەموو گرفتو داماوی‌و ڕووزەردی‌و تاریکستانێك گوناهو تاوانە!

ئافرەتێك دوعای دەکردو دەپاڕایەوە: خودایە دەرگای ڕەحمەو بەزەیی‌و لێبوردنی خۆتمان بۆ بکەیتەوە!

رابیعەی عەدەوی پێی گوت: داماو، خودا کەی ئەو دەرگایەی داخستووە تا بیکاتەوە؟!

ئازیزم، هەمیشە دەرگای تەوبەو لێبوردنی ئیلاهی لەسەر پشتە!

با گوناهەکانمان بێ هیوامان نەکەن‌و شەیتان تەفرەمان نەداو هەمیشە زایەڵەی ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ ﴾ طـه: ٨٢ لە گوێچکەماندا بزرنگێتەوە!

با سروەی سەحەر لە خەوی غەفڵەت وەخەبەرمان بهێنێ‌و دڵی مەستمان بێنێتەوە هۆش!

با بچینە ڕیزی ﴿ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ الذاريات: ١٧ - ١٨.. بە چەند دڵۆپە فرمێسکێکی گەرم پەیامی خۆشەویستیمان بۆ خوداوەند بنوسینەوەو لە ساتەوەختێکی ئەفسوناویدا تێکەڵ بە ڕازو مەحەببەتی خودایی بین‌و هەست بە پروشەی میهری خودایی بکەین کە چۆن دیوەخانی تاری دڵمان ئاوەدان دەکاتەوەو خۆشی بە ڕۆحمان دەبەخشێت!

بە ئومێدی نزای خێر لە ئەسحارا، بە خودات دەسپێرم..

زۆر دەمێکە عەودالی مانای تەواوی ئەم فەرموودەیە بووم...

«أَنْ تَعْبُـدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَــرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ» زۆربەی ئەو کتێبانەی کـە ڕاڤەی ئەو فەرموودە بــەرزو پیرۆزە دەکەن گەرام، وەلێ تینوێتی دڵی منیان نەشکاند، ئەوەی کە زۆر هەوڵی لێکدانەوەی ماناکەی دابێت گووتویەتی ئیحســان کە بەرزترین پلەی ئیمانە دوو مەرتەبەی هەن: یەکەمیان «مشــاهدة» کە بگەیتە ئاســتێك وەکو ئەوەی خودا بە چاو ببینی! هەســت بە بینینی بکەی‌و لە شــەرمی دیداری خودا بە هیچ شتێکەوە سەرقاڵ نەبی کە ئەو پێی ناخۆشە! بەڵام ئەمە چۆن‌و بۆچی! چۆن بگەینە وەها پلەو مەرتەبەیەك ئەوەیان زۆر درێژە پێنەداوە!

مەرتەبەی دووەم: «مراقبة» چاودێری خودایی، هەستکردن بەوەی خودا هەمیشــە چاودێرەو هەموو کات دەمانبینێت! هەربۆیە نابێت لە شوێنێك غایب بین کە ئەو دەیەوێت لەوێ بین! لە شوێنێك حازربین کە ئەو پێی خۆشنەبێت لەوێ بمانبینێت!

ئازیزەکەم: ئێمە چەندین ســاڵە ئەم فەرموودەیەمان دەیان‌و سەدان جار خوێندۆتەوەو گوێمان لێبووە! وەلێ لە خۆمان نەپرسیوە دەکرێت ئێمەش بگەینە وەها پلەیەك؟!

لــە خۆمان نەپرســیوە خودایەك کە دەفەرموێــت: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ الأنعـام: ١٠٣. بۆچی دەیەوێت ئێمــە ببینێت؟ دەکرێت ئێمە بە دڵ وەها پەیوەندییەك لەگەڵ خوداوەند دروست بکەین کە بیبینین بە چــاوی دڵ؟ بینینی حەقیقی دەبێت هەر بە چاو بێت! یاخود دیداری چاو بەراورد بە دیداری دڵ‌و ڕۆح هەر بینین نییە!

ئەگەر دیداری چاو هێندە گرنگە، بۆچی خودا خۆی لە خۆشەویستان پەنهان کردووەو وەڵامی موسای کەلیم بە (لن ترانی) دەداتەوە!

ئەویندارانی خودا هەموو عومریان سووتانە بە مەحەببەتی ئیلاهی، بەڵام تا ڕۆحیان لە لاشەدا بێت بە دیداری ئیلاهی شادنابن!

ئەویندارانی خودا خۆ هێشتا بە دیداری ڕووخساری نووربەخشی خودایی موشەرەف نەبوون، ئەی چۆنە لە سەرەتای سەحەرا لێویان هەڵدەقرچێ و دڵیان هەڵدەگیرسێ و، جەستەیان وەکو بێ ناو ئاو دەلەرزێ؟

وَإِنِّي لَتَعْرُونِي لِذِكْرَاكِ هِزَّةٌ كَمَا انْتَفَضَ العُصْفُورُ بَلَّلَهُ القَطْرُ

هەڵبەت مەبەست لەو دیدارە دیداری زاتی ئیلاهی نییە، بەڵکو موشاهەدەی سیفاتی خودایە، هەستکردنە بە شوێنەواری سیفاتی بەرزو ناوی جوانو ڕازاوەی، چونکە وەکو دەڵێن «المُشاهَدةُ بالشُّعورِ لا بِالحُضورِ» بینینی ڕاستەقینە بە هەستکردنو یادو یادەوەری و ئیحساسە، نەك بە ئامادەبوونی خود!

هاوکات بینینی خوداوەند لە دونیا بە سۆمای چاوی ئێمە مەحاڵە!

خۆ ئەگەر بهاتبایە خوداوەند لە دونیا خۆی نیشانی هەموو بەندەکانی بدابا ئەوە لەشەرمی دیدارو هەیبەتی ئیلاهی کەس نەیدەتوانی سەرپێچی فەرمانی خودا بکات!

وەلێ گەورەیی بۆ کەسێك، کە خۆشەویستی و ئەوینی خودایی هێندە وابەستەی فەرمانەکانی خودای کردووە، لە شەرمی خوداوەندو سۆزی ئەوینو تاسەی ڕۆژی دیدار ناتوانێت سەرپێچی ئەمری ئیلاهی بکات.

چونکــە ئەو بەندەیــە لە تۆماری خۆشەویســتانی خــودادا نێوی نوسراوە، لە کۆڕی فریشتەکانی ئاسماندا نێوی براوە!

ئیبنولقەیم دەڵێت: "هەرکاتێك خودا کەسێکی خۆشبوێ مەحەببەتی خۆی لە نێو دڵی دەنێ!"

خۆشەویستی ڕاستەقینەی ئێمە سەرچاوەکەی خۆشەویستیو لوتفی ئــەو پەروەردگارە مەزنەیە بــۆ ئێمە! گرنگ نییە ئێمەی بچووك ئەو خــودا گەورەیەمان خۆشــبوێ، ئەوەی زۆر گرنگــە ئەوەیە ئەو خودا گەورەیە ئێمەی خۆشبوێ!

بــەو هەموو لوتفو گەورەییو دەســەڵاتە بێ ســنوورەیەوە بانگی جبریل بکاتو بفەرموێت: "ئەی جبریل من فلانە بەندەم خۆشدەوێت، تۆش خۆشت بوێ!"

ئــەو کات جبریل چۆن کەســێکی خۆشــناوێت کە خۆشەویســتی خوداوەندە؟!

ئەویش لە نێو ئاســمانەکاندا بانگی هەموو فریشــتەکانی ئاســمان دەکات: خودا فلانە بەندەی خۆشگەرەکە ئێوەش خۆشتان گەرەکوێ!

دواتر خودا لەســەر زەویش خۆشەویستی ئەو مەحبوبەی خۆی لە دڵی بەندەکانیدا پەخش دەکات!

ئیمامی زەهەبــی دەڵێت: "هەر بەندەیەك ڕووی دڵی بکاتە خودا، خودا ڕووی دڵی بەندە باوەڕدارەکانی دەکاتە ئەو!".

ڕووکردنــە خــودا واتە ڕووکردنە هیوایەکی نەبــڕاوە، هێزێکی بێ سنوور، خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە، میهرو ئەوینێکی ئەبەدییە!

ئەو کاتەی مرۆڤ دڵی وابەستەی خودا دەبێت، ئیتر دەرگای هەموو هیــواو ئاواتەکانــی بۆ دەکرێتــەوە! دڵنیا دەبێت کە ئــەوەی خودا لە ئاســمان بەوی دەبەخشێت، کەســێك لەسەر زەوی ناتوانێت ڕێگری لێ بکات!

ئازیزم: هەمیشە هەموو هیواو ئاواتەکانت وابەستەی خوداوەند بکە، چونکە کەســانێك هەبوون کە هەموو هیواو ئاواتو ئارەزووەکانیان بە مرۆڤێکی لاوازی وەکو خۆیانەوە پەیوەســت کرد! بەڵام کاتێك هەموو ئاواتو هیواکان نایەنەدیو ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد نایگاتێ، تووشــی بێهیواییەکی تاڵ دەبێت!

لە هەموو شــتێك بێ هیوا دەبن، لەو کەسەی خۆشیانویستووەو لە هەموو ئەو هیواو ئاواتانەی کە هەیان بووە!

بــەڵام ئەوەی ڕووی دڵی هەمیشــە لە خودا بێــت، هەرگیز بێهیوا نابێت!

ئەوەی دەستی بە ئەڵقەی خوداییەوە گرتبێت بێهیوا نابێت!

ئیبنولقەیم دەڵێت: نێوەندی سەعادەتی دونیاو ئاخیرەت، پەیوەستە بە دەستگرتن بە فەرمانی خودا!

لە دونیادا ســەرفرازی هاودەمی ئەو کەسەیە، کە جگە لە گەیشتن بە ڕەزامەندیو خۆشەویستی خودا هیچ ئاواتێکی دی نییە!

چونکە دەزانێت هەموو کارەکان بە دەست ئەون، هەموو تکاو ڕجاو داواکارییەکان لەلای ئەون! بێ فەرمانی ئەو، خۆ هیچ ناکرێت!!

دەزانــێ کــە هەموو لوتــفو خەڵاتێکی ئەو، ســەرمەدین، هەرگیز

گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت، گەر خۆشەویستی خودا بەدەستبێنی، ئیدی ئەگەر هەموو دونیا پشتی تێ بکەن بە خەیاڵیدا نایەت، وەلێ ئەگەر هەموو دونیا ڕوویان بکەنە ئەو، بێ خۆشەویستی خودا، هیچ سودێکی نییە!!

ئەو کات پێویستە هەموو ڕێگایانە ڕێبەندکەین کەلەو ئەوینە خوداییەمان مەحروم دەکات، کە تاوانو گوناهو شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو ڕێچکەی یەکەمی هەموو ڕێگاکانە!

تاوان مایەی دوورکەوتنەوەیە لە خودا، مایەی هەژاریو داماویو هەناسە ساردییە!

ڕووکردنە شاوەتو ئارەزوو هەموو پێوەرەکان دەشێوێنێ، هەموو بینابیەکان لێڵ دەکات، جوان ناشیرینو ناشیرین جوان دەکاتو بەرگی حەق دەکاتە بەر باطلو، بەرگی باطلیش دەکاتە بەر حەق!

گوناه سەرچاوەی هەموو دەردەسەرییەکانی مرۆڤە!

لە بەرامبەریشدا ملکەچبوون بۆ فەرمانی خودا، پێشخستنی ویستی خودا بەسەر ویستی نەفسو ئارەزوودا، ڕێگای ئازادیو سەرفرازیو ڕزگارییە!

لەزەتی تاعەت بێ وێنەیە! لەزەتی گوناه حەددی چییە بگاتە گەردیلەیەك لەو لەزەتو خۆشییە!!

ژیان لە سایەی قورئانو پەیامی ئاسمانو، چرای نووری ئیلاهیدا دەگاتە لوتکەی بەرزیو بڵندیو لەزەتی ڕۆح!

کەواتە هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەقامی "موشاهەدە" خەونو ئاواتی

## خۆشەویستانی ژێرمەندی خودان!

زمانیـــان هەمیشـــە بـــە نێوی خـــودا پـــاراوە، ڕووی نیـــگای دڵیان ئاســـمانە! چاویان بە سورمەی شەرم ڕشـــتووە، لە هەموو بزووتنەوەو جوڵەیەکدا لەگەڵ خودادا دەژین، هەست بە سیفەتی خودای "رقیب"و "ســـمیع"و "بصیر"و "علیـــم"و "خبیر" دەکەن، بە کـــردارو گوفتاری جوانیان جوانترین نمایش دەکەن. فریشـــتەنو بەسەر زەویدا دەڕۆن! جگـــە لە ســـودو جوانیو میهرەبانی زیان بـــە مێروولەیەك ناگەیەنن. پاکی ســـیمایانە، میهرەبانی کالاّیانە، دەســـتپاكو زمانپاكو هەستپاكو دڵپاکـــن. ئەوانـــە پەروەردەی ژێـــر ئەزەری ئیلاهیـــن! ئەوانە عالەمی غەیبو شەهادەیان پێکەوە گرێداوە، ئەوانە پەنهانی خۆیان پاراستووە، خوداش ئاشـــکرای جوان کردوون.﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾ الملك: ١٢




# نامەی بیست و چوار

بەرماڵەکـەت ڕاخە بـۆ موناجاتـی ئیلاهی، تەنها بـۆ بچکۆلەیی بەرماڵەکـەت مەڕوانـە، ئـەوە پەڕەیەکی سـیدرەتولمونتەهایە، ئەوە پەیکی فەرشی دڵە بۆ خاوەنی عەرش!

ئەو چەند بسـتەی تۆ لەسـەری، نوێژی نـزاو پاڕانەوەت دادەبەسـتی، نیشتمانی ڕۆحە دانیشتوانەکانی هەرگیز شکست ناهێنن!

ئەوە دەڤەری توهرو شنەی بەهەشتی نەبڕاوەیە!

لە کلاورۆژنەی ژوورەکەتەوە تەماشای مانگی چواردە بکەو ڕووبکەرە خودای میهرەبان!

با دڵت لە سینگت بێتە دەرێو بەرەو لای خوداوەند، بدا لە شەقەی باڵ!

ئـەو کاتەی کە ڕەشـماڵی شـەو بە بەرگـی ڕەش و قەترانی خۆی، هەموو دونیای سیاپۆش کردووە، چرای ئیمان شەوقی بێ وێنەیە!

ئەو کاتەی کە هەموو دۆستانت خەوتوونو ئاگایان لە دەردو ئاهی تۆ نییە!
بزانە کە خودایەکت هەیە هەرگیز ناخەوێت! ئەو خودایە کاروکاری
تۆی هەموو بە دەستە! بێ فەرمانی ئەو قەڵەم بە کاغەزدا ناهێنرێت!
مرۆڤـەکان ناتوانن ئـازارت بدەن، ببنە کۆسـپی بەردەمت، ئەوان
تەنهـا ئەوەیان پێدەکرێت کە ئەو کارە ئەنجـام بدەن بەرامبەرت کە
خوداوەند فەرمانی پێیەتی!

ئـەوان جگە لــە جێبەجێکردنی قەدەری ئیلاهــی هیچی دیپان لە
دەست نایەت!

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ التوبة: ٥١

ئێمە بێ تەوەککولی خودایی هیچێ نین لەم گەردونەدا!!

کُلُّ هذا قَولُنا لَكِنَّنا عَدَمٌ إن لَم يُعِنّا رَبُّنا ـئیقبال-

واتە: ئێمە هەموو هەر دەڵێین: «ان شاءالله»، وەلێ گەر یارمەتیدانی
خودایی نەبا ئێمە جگە لە عەدەم چیدی نین!

کەواتە خەمەکانت وەلانێ، ئیدی لە بیری ئەواندا مەبە، خوداوەندی
تۆ هەرگیز لە بیرت ناکات ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ مریم: ٦٤.

لەم ڕۆژگارە سەختەدا، ئەنیسی ئەم وەحشەتە جگە لە کردگار کێیە!
گەر شـەونمی میهـری ئەو نەبا، دڵمان دەبووە بەردەڵانو سـۆمای
چاومان کوێر دەبۆوە!

بەڵام ئەو پەروەردگارە میهرەبانە هەموو هیواو ئاواتێکی ئێمەیە!
دڵۆپێ ئاوی دەستنوێژ، پەرێزی خەمەکانم دەشواتەوەو، بڕست دەدا

بە ڕۆحم!

چرپەی ﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ البقرة: ٤٥ دەستم دەگرێ‌و هێزێك بە ئەژنۆم دەبەخشێت! کە هەرگیز لەشکری غەم نەتوانێ خۆی لە قەرەی بدات!

ئـەو کاتەی بـە دەم هەنیسـکی قـوڵ‌و قوڵپی گریانـەوە هەناوم دەلەرزێ‌و تێکەڵ بە سـەدای «یارب، یارب» دەبێت، دەزانم خوداوەند دڵم ناشکێنێت!!

ئاخر من جگە لە ئەو کێم هەیە! تا سکاڵای دڵمی بەرمە لا؟!

لەم شەوەدا، کێ دەرگام لێدەکاتەوە، ئەو نەبێ؟!

کێ ئاگای لە ناڵەو گریانی منە، ئەو نەبێ؟

کێ سەکینەت‌و نەفەحاتی میهری خۆیم، بەسەردا دەبارێنێ، ئەو نەبێ؟!

کێ خۆشیدەویێم بە کەماڵی مەحەببەت، ئەو نەبێت!

خودایە.. خۆشـم دەوێی، خۆشەویسـتی تۆ نەبا بەم نیوەی شـەوە نەدەهاتمە ژووان!

خەجاڵەتـم خوداوەند... تۆ بەو گەورەییەی خۆت حەوت ئاسـمان هاتـی بەرەو پیری بەندەکانی خۆت، منی بچکۆلە تەنها توانیم چەند هەنگاوێـك لە پێخەفەکەم دوورکەومەوەو، بێمە نێو نیشـتمانی نوور، بێمە سەر بەرماڵی عبودییەت!

ئای ڕووزەرد خۆم خودایە!

وای، پەروەردگارم، چۆن سوپاسـی تۆ بکەم، ئاخر لوتفی تۆ بە کێ سوپاس دەکرێت؟!

لەو ڕۆژەوە تۆم ناسـیوە، نـاوی پاکت بۆتە ویردی زمانم، بووم بە

خەزنەداری چی سەلتەنەتێك، بووم بە چی ئینسانێك؟!

هەتا ئەو ئاوە پاکەم کردە زیکرو فیکری ڕۆژو شەو

هەناسەم بۆنی میسکی گرتووە، لێوم شەکەربارە —مەحوی—

ئازیزم: ئەوەی کە قوتی ڕۆح‌و گیانی ئێمەیە بەدەستهێنانی

خۆشەویستی ئیلاهییە! دەزانی ئەو کەسەی خودا خۆشی بوێ خودا

چی بۆ دەکات!؟ پەروەردگار لە فەرمودەی قودسیدا دەفەرموێت: «فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِيْ يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِيْ يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِيْ بِهَا. وَلَئِنْ سَأَلَنِيْ لأُعطِيَنَّهُ، وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِيْ لأُعِيْذَنَّهُ» —البخاري—

وای ئازیزم خۆشەویستی چەند بەرزە، با ئەوینداران بێن‌و لە

ژوانی ئیلاهیدا وانەی عیشق بخوێنن! عیشقی حەقیقی، ئەوینی نەمر!

ئەوینێك کە خوداوەند پیرۆزبایی لێ دەکات!

سەیرە، خوداوەند بەو عەزەمەت‌و گەورەیی خۆیەوە خۆشەویستی

هەن! دەیەوێت لە ئەویندارانی خۆی نزیك بێت، لە بیستن‌و بینین‌و

هەموو جوڵەیەکدا لەگەڵیاندا بێت!

خوداوەند ناهێڵێ جگە لە باشە وتەیەکی دی بژنەفن!

جگە لە دیمەنی جوان‌و پاك دیمەنێك ببینن!

ناهێڵێت دەست بۆ شتێك بەرن، بەرەو کارێك هەنگاو بنێن کە ئەو

پێی خۆش نییە!

پەیمانی داوە بە خۆشەویستانی، هەرچی داوا بکەن پێیان

دەبەخشێت!

لە هەر شتێکی مەترسیدار داوای پاراستن بکەن دەیانپارێزێ!

ئەوان لە ژێر چەتری پارێزگاریی خوداییدا دەژین! ئەوان دۆستو خۆشەویستی خودان! خوا لە مەلەئی ئەعلا ناویان دەباو باسیان دەکات!
دەرگای ڕەحمەتی بۆ کردونەتە سەر پشتو، هەرگیز لە گوڵزاری بێ سنووری میهری خۆی وەدەریان نانێ!!

ئەمەیە دەریای ئەوین، جۆگەلەی هەر ئەوینێك نەچێتەوە نێو ئەم دەریایە، ئەوە جگە لە سەراب هیچی دی نییە! هەر ئەویندارێك هەموو ئاواتی مەحەببەتی ئیلاهی نەبێت، ڕاست ناکات!
جگە لە فریودان هیچ شتێکی دی پێ نییە!

هەر شەیدابوونێك تێکەڵ بە شەیدابوونی خودا نەبووبێت، تەنها بۆ چەند ساتێکی کەمەو وەکو پەڵە هەوری هاوین، لە چاو تروکانێکدا دەڕەوێتەوە!

بەرماڵەکەت جێمەهێڵە، ئەوێ ئارامترین هێلانەیە! لەوێدا هەموو برینەکان سارێژ دەبن، ئازارەکان لەبیر دەچنەوە! لە ژاوەژاوی ڕۆژگارو تیغی ژاراوی زمانی بە نێو مرۆڤەکان ڕزگار دەبیت! دەچیتە سنووری بێ سنووری پەناگەی ئیلاهی!

کۆڵی گوناهو تاوانت دادەنێیو دەگەیتە ئاسودەیی ڕۆح!

پەیامبەری ئازیز دەفەرموێت: «کاتێك نوێژخوێن نوێژ دادەبەستێت، هەموو گوناهەکانی لەسەر شانی دادەنێن، لەگەڵ هەموو کڕنوشو سوژدەیەکدا، پەیتا پەیتا هەڵدەوەرێنو دەکەونە خوارەوە...» السلسله الصحیحه ١٣٩٨

ئەوێ دەریای زیوە.. لەوێدا دڵو لاشەمان لە هەموو گوناهەکان

پاك دەكەینەوە! بە زمانی فرمێسك‌و نزای سوتاوانی ئەوین، بە چرپە تكاكانمان بەرەو عەرشی كردگار بڵند دەكەین!

دەستە بچكۆلەكانت بڵندكە نێوان تۆو كردگار تەنها دوعایەكی گیرایە، كە ئیخلاس‌و ملكەچبوون‌و بەندایەتی‌و خۆشەویستی، وشەكانی وەكو ملوانكەی مرواری هۆنیوەتەوە!

بەردەوامبە، نزاكان ناگەڕێنەوە، تا ئێمە ڕووی دڵمان وەرنەگێڕین!

ئیدی ئێمە ڕووی دڵمان، لەو پەروەردگارە گەورەو بەخشندەو میهرەبانەیە!

چاومان تەنها لە دەستی ئەوەو جگە لە ڕازیبوونی ئەو مەبەستێكی دیمان نییە!

گەیشتن بە خوداو چونە نێو دیوانی خۆشەویستان، گەیشتنە بە هەموو خۆشی‌و نیعمەتەكانی دونیاو ئاخیرەت!

مەحروم بوونیش لە خودا، مەحروم بوونە لە هەموو شتێك! هەموو شتێك....!!

خوداوەند دەلیلی داماوە، هەموو كارەكانت تەسلیمی ئەو بكە!

هیچ كارێك بێ ویستی ئەو سەرناگرێ!

فەرمانێكیش ئەو بیەوێت بە هیچ كەس ڕێگری ناكرێت!

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾ الأحزاب: ٣

مامۆستا گیان؛ شەوانە تا تێر نەگریمو سینەم بە پروشەی فرمێسکی دیدەم گوڵاوپرژێن نەکەم خەو ناچێتە چاوم، تا هەموو شـەوێ سکاڵای دڵم بۆ لای عەرشـی خودا بەرزنەکەمەوە، ئۆخژنی دڵم نایەت! ئۆقرە ناگرم گەر شەوێك بوخچەی ڕازو نیازی خۆم بۆ خوداوەند واڵا نەکەم، هەرچەندە دەزانم هەموو شتەکان لای ئەو کردگارە مەزنە واڵایە! بەڵام من کێم هەیە جگە لە ئەو تا سکاڵاو شەکوای دڵی خۆمی لا بکەم!؟




٥٧

نامەی بیست و پێنج

ماموستا گیان؛ شەوانە تا تێر نەگریم‌و سینەم بە پروشەی فرمێسکی دیدەم گوڵاوپرژێن نەکەم خەو ناچێتە چاوم، تا هەموو شەوی سکاڵای دڵم بۆ لای عەرشـــی خودا بەرزنەکەمەوە، ئۆخژنی دڵم نایەت! ئۆقرە ناگرم گەر شەوێك بوخچەی ڕازو نیازی خۆم بۆ خوداوەند واڵا نەکەم، هەرچەندە دەزانم هەموو شتەکان لای ئەو کردگارە مەزنە واڵایە! بەڵام من کێم هەیە جگە لە ئەو تا سکاڵاو شەکوای دڵی خۆمی لا بکەم؟!

من شەرمەندەم بەرامبەر خوداوەندی خۆم..... پشتم لە ژێر کۆڵی گرانـــی تاوان چەمیوە، دەڵێـــم بەڵکو خودا بە فرمێـــسکەکانم لاپەڕە ڕەشەکانی تاوانم بۆ بسڕێتەوەو لێم ببورێ....!!

ئازیزم خۆزگەم بە خۆت.. هیوادارم چاوەکانت لەو چاوانەبن کە هەرگیز وەبەر گڕی دۆزەخ ناکەون، پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموێت: «عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ، وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». واتە: دووچاو ئاگریان ناگاتێ، چاوێك لە ترسی خودا گریا بێت، چاوێکیش لە پێناوی خودادا پاسەوانی کردبێت!

الترمذی باسناد صحیح.

لەو موژدەیەش خۆشتر، یەکێك لەو حەوت کۆمەڵەی کە لە ڕۆژی دواییدا لە ژێر سێبەری عەرشی خودادان، ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر دەفەرموێت: « وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ» البخاري ومسلم.

واتە: کەســێك لە تەنیاییدا یادی خودای کردوو، لە تاسەو شەوقی دیداری ئیلاهـــی‌و هەیبەت‌و جەلالی خوداییدا، ئەســرین بە چاوانیدا هاتنە خوارێ، چونکە ساتەکانی یادی خودایی‌و خەڵوەت لەگەڵ خوداو موناجاتی ئیلاهی، تەزوو بە ڕۆحدا دێنن‌و ناخی مرۆڤ دەهەژێنن!!

ئەو دڵۆپە فرمێسکانە ئەزیزم، لای خوداوەند زۆر بەنرخن، دەزانی خودای گەورە چەندی خۆشدەوێن؟! فرمێسکو ئەسرین پەیامی ئەوینی رۆحە! رەجاو پاڕانەوەی دڵە! ئای کە هەڵبەستێکی سەیرە، بێ هیچ پیتێك هەموو هەستەکان کەمەند کێشەکات!!

دەزانی پەیامبەر چی دەفەرموێت؟!

دەفەرموێت: «هیچ شتێك لای خودا لە دوو دڵۆپ خۆشەویستر نین! دڵۆپێك فرمێسـك لە ترسی خودا، دڵۆپێك خوێنی ڕژاویش لە پێناوی خودادا!

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەفەرموێت: «فرمێسکێك بڕێژم لە ترسی خودا، پێم خۆشـترە لە بەخشـینی هەزار دینـاری ئاڵتون لە پێناوی خودادا.

کەعبی ئەحبار دەفەرموێت: «گریانم لە پێناوی خوداو فرمێسـك ڕشتنم پێخۆشترە، لەوەی کە بە کێشی خۆم ئاڵتون بکەم بە خێر!»

گریان ئازیزم، هێمن بوونەوەی ڕۆحە، ئارامگرتنی دڵە، ئاسودەیی بێ سنوورە، گریانە بۆ دیداری ئیلاهی «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ».

ئەوەی شەیدای دیداری خودایی بێت خوداش شەیدای دیداری ئەوە!

ئـەو گریانە هەڵقرچانە لە دووری مەحبـوب، کڕوزانەوەیە لەبەر دەروازەی میهری خودایی...

لە خانمـی یەکەم، خاتوو عائیشـەی خۆشەویسـتی پێغەمبەریان پرسی: سەیرترین شتێك کە لە پێغەمبەرت بینیبێت چی بوو؟!

دوای سـاتێك بێدەنگیو گەڕانەوە بۆ گوڵاڵەی یادگارییە جوانەکان لەگەڵ ئازیزدا، گوتی: شەوێك لە شەوان فەرمووی: عائیشە لێم گەڕێ

با ئەمشەو خەریکی خودا پەرستی بم، منیش گوتم: بەخودا من حەزم لە نزیکی تۆیە! وێڕای ئەوە حەزم لەو شتەشە کە تۆ پێی دڵخۆشی!

پاشان هەڵسا دەستنوێژی هەڵگرتو ڕاوەستاو نوێژی دابەست!

لەدوای وی دەستی بە گریانێ کرد تا کۆشی تەڕبوون!

پاشان دانیشتو هەر دەگریا، تا ڕیشی تەڕبوو!

پاشان گریا تا فرمێسکەکانی ڕژانە سەر زەوی!

لــە دواییدا بیلال هــاتو کاتی نوێژی بەیانی پــێ ڕاگەیاند، بەڵام کاتێــك بینی دەگری!! گوتی: ئەی پەیامبەری خودا، ئەوە دەگریت، لە کاتێکدا خودا لە گوناهی لەوە پێشو لەوە دوات خۆشبووە؟

پەیامبەریش فەرمووی: ئەی نابێت من بەندەیەکی سوپاسگوزاربم؟!

ئەمشەو ئایەتێکم بە سرووشی خودایی بۆ هاتووە، هاوار بۆ کەسێك بیخوێنێتەوە، بەڵام بیری لێ نەکاتەوە!

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران.

خۆزگــەم بەو بەندەیەی هاودەمو هۆگــری قورئانی پیرۆزە لەگەڵ خوێندنــەوەی پەیامــی خوداوەنــدا هۆن هۆن فرمێســك وەکو دەنکە مرواری بەسەر گۆنایدا دێنە خوارێ!

ئازیزم وشــەکانی قورئــان، وتەی ئەویندارى گــەورەن، فەرمودەی حەبیبــی دڵــن، گــوڵاوی وشــەگەلێکن کە هەرگیــز لەوان خۆشــتر نەبیســتراوە! چی چرپەیەك خۆشترە لە چرپەی ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر.

ئەنەس دەفەرموێت: پەیامبەر «درووودی خوای لێبێت» وتاری دەدا، وتارێك کە هەرگیز گوێبیستی وەها وتارێك نەبووبووم دەیفەرموو: ئەوەی من دەیزانم سەبارەت بە گەورەیی خوداو سزای بۆ تاوانباران و سەختی ساتەکانی مەرگو نێو گۆڕ، ئێوە بتانزانیبا ئەوە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان!!

ئەنەس دەفەرموێت: هاوەڵانیش ڕووخساری خۆیان داپۆشی و دایان لە پرمەی گریانێکی بەکوڵ.

یەکێك لە پیاوچاکان ڕۆژو شەو فرمێسکی چاوی ڕانەدەوەستا!

لێیان پرسی: بۆچی وا دەگری؟!

لە وەڵامدا گوتی: دەترسم خودا منی لەسەر گوناهێك ببینێت و پێی گوتبێتم: برۆ من لێت تووڕەم!

یەزیدی ڕەققاشی هێندە دەگریا پێیان گوت: ئەگەر ئاگر تەنها بۆ تۆ دروستکرابا، لەوە زێتر نەدەگریای، بۆ وا دەکەی؟

ئەویش گوتی: ئەی ئاگر هەر بۆمن و هاوشێوەکانی من لە مرۆڤ و پەری دروست نەکراوە!؟

فوزالەی سەیفی زۆر دەگریا، لە خێزانەکەیان پرسی: ئەوە بۆ وا دەگری؟

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: سەفەرێکی دوورو درێژی لەبەرەو تونیشووی بۆ ئامادە نەکردووە!

سَفَرِي بَعِيدٌ وَزَادِي لَنْ يُبَلِّغَنِي

وَقُوَّتِي ضَعُفَتْ والمَوتُ يَطْلُبُنِي — زين العابدين

خالیدی سەدوسی دەڵێت: باوکم کە هاوڕێیەکی نزیکی سوفیانی

ســـەوری بوو، بۆی گێڕامەوە دەمەو نیوەڕۆیەك بۆ ســـەردانی سوفیان داوای مۆڵەتم کرد منیش چوومە ژووری‌و بینیم وا دەڵێت:

﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ..........(٨٠) ﴾ الزخرف.

واتە: تاوانباران وادەزانن ئێمە چرپەو ڕازو نهێنییەکانیان نابیستین؛ ئەویش دەیگوت: بەڵێ پەروەردگار، بەڵێ پەروەدگار!

پاشان هەنیسکی دەداو دەگریاو تەماشای سەقفی ژوورەکەی دەکردو فرمێســك بە چاوانیـــدا دەهاتنە خواری!! تا ماوەیەکی زۆر دانیشـتم، پاشـــان ڕووی کردە منو گوتی: لە کەیەوە لێرەی؟ هەســـتم بە هاتنت نەکردبوو!!

ئازیزم.. ناچارم کۆتایی بە نامەکەم بێنمو جێت بهێڵم، ئێســـتا لای ئێمــە دەمەو ئێوارەیە، هەور بەری ئاســـمانی گرتووە، لەو کەشوهەوا خەمگینەیـــە کـــە تۆ حەزی پێناکـــەی، هیوادارم ئێـــوارەی ژینی هیچ کامـــان، وەهـــا کپو بێدەنگو بـــێ چرا نەبێت، هیـــچ پەڵە هەورێك تیشکی نوورمان لێ نەشارێتەوە!!

لەگەڵ دوا وشـــەی ئەم چەند دێڕە شـــیعرەدا ماڵاوایت لێ دەکەمو هیوادارم لە دوعاو نزای سەحەرو فرمێسکی شەو، بێ بەشمان نەکەنو لە پەراوێزدا بۆ بەندەی زێدە گوناهبار، لە پەروەردگار لەگەڵ جەمعی ئەهلی ئیمانا داوای لێخۆشبوونو عەفووی ئیلاهی بکەن...

ئێـــوارەی ژیـــن بەســـەردا هات ناچـــاری بـــازاڕ هەڵگری
بـــەرەو ماڵـــی گـــۆڕی تارت بـــە تەنهـــا ملـــی ڕێ بگری
گوناهـــت کـــرد تامـــی ڕۆیـــی ســـزاکەی وا چاوەڕێتـــە
دە فرمێســـکی پەشـــیمانی هەڵوەرێنـــە هەتـــا دەمـــری..

ئەووەڵ ســەحەری ڕۆژێکی موبارەکە، پێش بانگی بەیانی هەزاران ئەویــنــداری بێداری ئەوینی خودایــی وەکو پەروانە وەدەووری کەعبەی پیرۆزدا دەخولێنەوە.

هەزاران لە سوژدەو کڕنووشی ملکەچبوونو عبودییەتدا فرمێسك دەڕێژن، هــەزاران دەســتی نزاو پاڕانەوەیان بــەرەو لای خوداوەنــد بڵندکردووەو بە درووەی "یارب یارب" سکاڵای دڵی خۆیان دەکەن....!

چی ژوانێکی ئاوەدانە بە کۆڕی گەرمی عاشقانی ڕاستەقینە!

حــەرەم چراخانی نووری دیدەو نووری دڵو گڕی ئەوینو شــەوقی ئیمانە!

وەرەو ئازیزم لەم ســەحەرە موبارەکەوە با بۆنی میسكو عەنبەری کەعبەی شەریف ناخی دڵت مەست بکاتو سەرتاپای بەدەنت بهەژێنێ، چاوەکانت لێکبنێو بە ئەسپی خەیاڵ ئاسمان تەی کەو بگەرە بەتحای مەککــە، بەو ســەرابەدا گوزەرکە کە تیایدا بیلال بە دروشــمی "أحد، أحد" گوێچکەی ئەبو جەهلەکانی کەڕ دەکردا!

تەماشــای بسکی بە خوێن شەڵاڵی سومەییە بکەو پشتی داخکراوی خەبباب ببینە!

لــە دەرگای "بەنی شــەیبەوە" وەژوورکــەوەو ڕووەو بەردی ڕەشو کلی چاوی ئەویندارانی هەنگاو بنێ، تا تێر تێر ماچی بکەیو بە بۆنی نبووەتو ریسالەکەت ئاشنا بیت!

لە تەنیشت مەقامی ئیبراهیمەوە بە خێرایی گوزەر مەکە..یادی ﴿ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ ﴾ البقـرة، ١٢٧ بکــەرەوەو... لەگەڵ شنەی ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ﴾ ابراهيم، ٤٠ دا نوێژی دڵ دابەستە! بچۆ "ملتزم"و لەگەڵ یادی «هُنا تُسكَبُ العَبَرات»دا ئەســرینی چاوت

پیاوینه!
تەماشا... عاشقانی خوداوەند چەند زۆرن!!
گەر گەواهی ئەوین‌و خۆشەویستی‌و ئیخلاص‌و عبودییەتت پێ نەبێت، لە نێو ئەو عاشقانستانەدا چی دەکەیت؟!
ئێرە دەڤەرێکە لە بەهەشت، سروەیەکە لە فیردەوس، لەزەتێکە لە نێوی ڕەحیقی مەختومەوە!
ئێرە ئەزیزم خۆرئاوا دەبێت، بەڵام نوورئاوا نابێت!
ئێرە لەم دەڤەری نووردا جریوەی ئاوازی ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ و زیکرو یادی خوداوەند شنەی نەشئەی موستەغفیرینی ئەسحارە!
لە نێوەی شەودا گوێت لە تەپەی پێی ئەویندارانە لە نێوان سەفاو مەروادا بە سەدای «رب اغفر وارحم و تجاوز عما تعلم، انك انت الاعز الاكرم»
خورەی زەمزەم گوڵاوپرژێنی ڕۆح دەکات، دڵەکان وەکو بەرگی ئیحرامەکان سپی دەبنەوە! بە ئاوی زیو دەشۆرێن!
چاوەکان بە کلی "کەعبە" سورمەرێژ دەبن، سەرابی دونیا فەرامۆش دەکەن‌و بە ناخی حەقیقەتا ڕۆدەچن! لە وەهمی دونیای فانی‌و مەتاعی پڕ غرور ئازاد دەبن، ئێرە ئەزیزم بەندەکانی خودا لە ژێر تامی بەندایەتی بۆ خوداوەندا شا بە سەپان ناگرن!
وەکو پەروانەی دەوری شەم بە دەوری "بيت الله الحرام"دا دەخولێنەوە، ئای لە ساتە وەختەکانی تەوافی دڵ‌و ئۆخژنی ناخ‌و سوکنایی ڕۆح!!
ئەو ساتەی کە فرمێسک وەکو مرواری، بەسەر گۆنای تۆبەکارانا دێتە خوارێ، لاپەڕەی تاوان‌و گوناهی خۆیانی پێ دەسڕنەوە!
لێرەدا گەورەیی خوداو بچوکی مرۆڤ دەردەکەوێت....
دەسەڵاتی خوداو بێهێزی مرۆڤ.....

بچوکی دونیاو، فراوانی مەلەکوتی خودایی!

نەعیمی زائلی دونیاو، بەهەشتی نەبراوەی خودایی!

لێرەدا دەبینی چەندە جیاوازن، ئەوانەی پەروانەی دەوری عەرشی خودانو لێرە جگە خەلاتی لێخۆشبوونی خودایی، هیچ ئاواتێکی دیبان نییەو کەسانێکیش، لە دۆلی تاری دنیادا نوقم بوونو جگە لە کۆکردنەوەی خاشاکی دنیا، ئامانجێکی دییان نییەو ڕاکردنیان بە شوێن دنیادا جگە لە بازنەیەکی بەتاڵ چیدی نییە!

لێرە هەموو شتەکان تامیان هەیە، هەموو ڕەنگەکان درەوشاوەن. سروەی بەیان بە بۆی چرپەی ئەویندارا موعەتتەرە!

لێرەدا ژیان بەنرخە، چرکەکانی تەمەن بەهادارە، مرۆڤ هەست بە وجودی خۆی دەکات!

لێرە لە نێو ئاپۆڕای عاشقاندا دێیتو دەچی! بۆنی هەناسەی فریشتە دەکەی! سەکینەی خودایی ئارامی دەبەخشێ بە ڕۆح! لە دەریای ئەویندا دەتوێینەوە!

گەیشتن بە ماڵی ئەویندارى مەزن، لەزەتێکی هێندە گەورەیە زمان ناتوانێ گوزارشی لێوەبکات..!

سەرخستنە سەر بەر دەرگای خوداوەند، دوای تەمەنێک لە تامەزرۆیی‌و سوتانو گریانو هەلقرچان، گەیشتنە بە موورادی دڵ!

خۆشەویستێک کە هەموو ئاواتی گەیشتنبێت، بە خانەی ئەویندارەکەی، دەبێت کاتی لیقا چی هەستێکی هەبێت!!

لەوێ پڕ بە گەروت دەڵێی، خوداوەند خۆشم دەوێی، گەر خۆشم نەویستبای لەو ڕێیە دوورەوە نەدەهاتم، شەرمت لێدەکەم، لە سزای سەختت دەترسم، وەگەر نا، ئەوها بە کوڵ نەدەگریام، ئارەقی

خەجاڵەتیم نەدەرشت!!

خوداوەند، هەموو کەس و کارو ماڵ و حاڵم جێهێشت و خۆم هاویشتە

نێو ماڵەکەی تۆو، پەنام بۆ تۆ هێنا!

منی هەژار کێم هەیە تۆ نەبێ؟!

من بێ کەسم، بێ دەرو بێ نەوام....

تۆ نەبێ من چیم، چۆن دەژیم!

خودایە تۆ گەورەی.. بە گەورەیی خۆت بمبەخشە!

تۆ میهرەبانی بە میهری خۆت بمبورە!

تۆ دەوڵەمەندی من هەژارم

تۆ بەهێزی من لاوازم

تۆ بەخشندەی من تاوانبارم

من شەرمەندەم خودایە، وەلێ من بەندەی تۆم! خۆم بە بەندەیەکی

بچوکی تۆ دەزانم، لەم گوڵزاری ڕەحمی خۆتە دەرم مەکە!

چ خۆشە بەم هەموو عیصیانەوە، یا رەبی بمبەخشی

ببەخشە، بگرە، دۆزەخ، خۆڵەمێشی کەم بوو، یەك مسقاڵ

-مەحوی-




# نامەی بیست و حەوت

فرمێسکەکانت بسڕە،

دەرگا بۆ خەم والآ مەکە،

لەگەڵ خەفەتدا ژووان مەگرە،

دەست مەکەرە ملی ئەژنۆکانت،.....

تــۆ خودایەکی میهرەبانت هەیە، دەســتەکانت بۆ لای ئەو بڵندکەو

چاوەڕوانی لوتفی بێ سنووری ئەو پەروەردگارە بە.

برۆ ژێر سـێبەری دارەکەی موساو بێژە: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ٢٤﴾ القصص

لە تاریکی گەروی نەهەنگـی ئەم ڕۆژگارەدا لەگەڵ یونسـدا بڵێ: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧﴾ الأنبياء

جیهانی مـاددە فەرامۆشکەو لە مەداریجی ڕۆحـدا هەڵکشێ بۆ مەلەکوتی ئەعلا!

ئەو کاتەی لە هەموو مرۆڤەکان بێزاردەبیو، تەنیایی شاڵاوت بۆ دێنێ، هەست بە غوربەتو بێکەسی مەکە!

تۆ بەندەی خودایەکی، هەرگیز ئازیزانی خۆی فەرامۆش ناکات، تۆ ئەویندارێ خۆشەویستێکیت، هەرگیز ناهێڵێت ئەوینداراانی لە وەحشەتدا بژین!

لــە جــەرگــەی جــەمــی یــارانــی گـیـانـی
تــۆم نــەبــێ هـێـشـتـا خــۆم پــێ تـەنـیـایـە
تــۆم هــەبــێ تــەنــیـا لــە ئـیـنـفـیـرادی
لـێـم جــەمــە هــەرچــی خــۆشـی دنـیـایـە

-ئەحمەد موفتی زادە-

ڕووکە خودایەك کە دەفەرموێت: «وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْراً اقْتَرَبْتُ مِنْهُ ذِراعاً، وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَـيَّ ذِرَاعاً اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً، وإنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً» البخاري ومسلم.

خوداوەند دەفەرموێت: «من لەگەڵ بەندەکەی خۆمدام کاتێك یادم دەکات، ئەگەر ئەو لە خودی خۆیدا یادم بکات، منیش لە خودی خۆمدا یادی دەکەم، وەگەر لە نێو کۆڕو مەجلیسدا یادم بکات من لە کۆڕو مەجلیسی باشتردا یادی دەکەم، گەر بەندەکەم بستێك لێم نزیك بێتەوە، من گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر ئەو گەزێکیش لێم نزیك بێتەوە، من دووباڵ لێی نزیك دەبمەوە.

کە تۆ نزیکیی خـوداوەنـدت دەستکەوێ، بۆچی وێڵی نزیکیی بەندەکانی؟ یادی خوداوەند سروەی شادی نابەخشێ بە دڵت؟ پشوو نادات بە ڕۆحت؟

جا ئەگەر بە خودا هۆگر نەبیو دڵارام نەبیت ئیدی کێ ئارامیو خۆشبەختیت پێ دەبەخشێت؟

جگە لە هۆگربوون بە یادی خوداو ڕووکردنە لوتفی ئەو هەموو هیواکانی دی سەرابن!

کێ دڵنیایت پێ دەبەخشێت؟

کێ گریەو زاریت دەبینیێ؟

کێ دڵنەواییت دەکات؟

کێ هەمیشە ئاگای لێتە؟

کێ سکاڵاکانت لێ وەردەگرێ؟

کێ گرفتەکانت بۆ چارەسەر دەکات؟

کێ گرێکانی ژیانت بۆ دەکاتەوە؟

کێ دەرگای میهری هەمیشە بۆ کردویتەتە سەر پشت؟

کێ لە بەڵاو موسیبەت دەتپارێزێ؟

کێ بە نووری ئیمان خانەی دڵی کردووی بە چراخان؟

کێیە ڕۆژانە پێنج جار بانگت دەکات، ژووانت بۆ دادەنێت؟

ڕێگات پێ دەدات بچیتە حزوری، بە دڵی خۆت بیدوێنی..؟

دەردی دڵی خۆتی بۆ بەیانکەی!!

چی هێزێك هەیە پشتی پێ ببەستی؟

چی پەناگەیەك هەیە ڕابکەی بۆلای؟

کێ دڵی شکاوت ئاشت دەکاتەوە؟

کێ لێوی هەڵقرچاوت ژیر دەکاتەوە؟

کێ هێز دەبەخشێ بە ئەژنۆت؟

کێ هیوا دەبەخشێت بە دەروونت؟

تۆی بێکەس کێت هەیە، جگە لە خودای گەورەو میهرەبان!

وەرەو با ڕابکەین بۆ لای ئەو «ففروا الی الله...»

با بچین بۆ لای خودایەك کە خاوەنی مەلەکوتی ئاسمانەکانو زەوییە!

با فرمێسك بڕێژین بۆ تاسەی دیداری خودا..

پیاو چاکێك دەفەرموێت، «گەر موخەییەربم لە نێوان ئەوەی (١٠٠) ساڵم تەمەنبێ لە خودا پەرستیداو یاخود، ئەمڕۆ ڕۆحم بکێشن، ڕۆحکێشانی ئەم ساتەی ئێستام هەڵدەبژێرم، چوون ئەوەندە بە تاسەی دیدارو شەوقی ئیلاهیم!

عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێت، «باوەڕدار، تا ئەگات بە

دیداری خودای خۆی، هەرگیز ئاسودە نابێ!

ئازیزم، پیاوچاکان ئـارەزووی ژیانیان دەکـرد، لە پێناو سەری سەحەرو سوژدەی تولانیو موناجاتی ڕەببانیو، نزاو پاڕانەوەی نیوە شەوو، ڕۆژوی قرچەی نیوەڕۆو، جێبەجێکردنی فەرمانی خودا... نەك بۆ کەیفـو ڕابواردنو تێکەڵاو بوونی مرۆڤانی بێ کارو بەندەگەلی بێ کەڵك!

ئەوانە تەنها ئەو کاتە دەتناسن کە کاریان پێتە، بەڵام خوداوند هەمیشە دەتناسێ!

ئەوانە تەنها ئەو کاتە ڕوویان لێتە، کە کارت پێیان نییە، بەڵام کاتێك کارت پێیان دەبێت، ڕوویان وەردەچەرخێنن!

بەڵام خوداوەند هەرگیز ڕووی وەرناچەرخێنێ، هەرکاتێك بتەوێت ڕووی تێ بکەی ئەو ڕووی لێتە، بە تایبەت لە کاتی نوێژدا بەرەو ڕووتە! «فَإِنَّ اللَّهَ قِبَلَ وَجْهِ الْمُصَلي».

ئەوان گەر داوایان لێ بکەیت بێزار دەبن، یاخود توڕەدەبنو حەز بە نزیکیت ناکەن، بەڵام خوداوەند پێی خۆشە داوای لێ بکەی، تا بۆت دەگرێت داوا بکە، گەنجینەی خودا پڕەو هەرگیز خاڵی نابێت!

ئەگەر تۆ واز لە داواکردن بێنی، ئەوا لێت دەڕەنجێ!

سەر هەڵبڕە بەرەو ئاسمان، دەستەکانت بڵندکە، چەند وتەیەکی جوانو دڵێکی پڕ لە ئیمان، پەیامی تۆ دەگەیەنێتە خودای ئەرزو سەماوات!!

لە سایەی میهری ئەو خودایەدا ژیانێکی ئاسودەو دڵێکی ئارام

بەدەست دێنی..

تەماشای «مەریەم» بکە لە ناڕەحەتترینو دژوارترین ڕووداودا کە هێندە ئەستەمە، دەگمەنە مرۆڤ بتوانێ بەرامبەری خۆی ڕابگرێ، خوداوەند پێی دەفەرموێت: ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا ﴿٢٦﴾﴾ مريم خودا فەرمانی پێدەکات ژیانی ئاسایی خۆی درێژە پێ بدات، بخۆرەوەو دڵخۆش بە، دەزانی بۆ!

چونکە چارەسەری هەموو کێشەکان لای خودان، خۆ ئەگەر هەندێك گرفتی چکۆلە بە مرۆڤەکان چارەسەربکرێن ئەوا گرفتە گەورەو سەختەکان، جگە لە خودا بە کەس چارەسەر ناکرێن!

کەواتە گرفتەکانت تەسلیم بە پەروەردگار بکەو خەریکی کاروبارو ژیانی خۆت بە!

بیربکەرەوە ئازیزم، ئێمە بۆ ئەوە دروست نەبوین کە خەم بخۆین، هەمیشە گرفتاربین! هەموو بەیانییەك بە دەم ویردو نزاوە داوای خێرو خۆشی بەرفراوانی ئەو ڕۆژە بکە، هەموو ئێوارانێکیش بەهەمان شێوە!

داوا بکە خوداوەند ئەوەت بۆ هەڵبژێرێ کە خێری تۆی تێدایە، کاتێکیش شتێکت لێ دەسێنێت دڵتەنگ مەبە، دڵنیابە لە بری ئەوە شتێکی دیت پێ دەبەخشێت

« فَما مَنَعَكَ إلّا لِيُعطِيَكَ، وَما أَعطاكَ إلّا لِيَبتَلِيَكَ»

ئەوەی لێی قەدەغە کردویت، بۆ ئەوەیە باشترت بداتێ، ئەوەشی کە پێی بەخشیویت، بۆ ئەوەیە تاقیت بکاتەوە!

زۆرجار بە ئەستەم دەتوانی جیاوازی بخەیتە نێوان خوێو شەکردا،
چونکە هەردووکیان لێکدەچن، وەلێ بە تاقیکردنەوە دەردەکەوێت!
مرۆڤەکانیش هەر ئاوان!

مەترسە دەڤەری بەندایەتی نیشتمانی ئارامییە!

ئەی نازانی کاتێك یەعقوب گوتی: ﴿ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ ﴾ یوسف: ١٣

یوسف شارایەوەو بینایشی کوێر بوو!

بەڵام کاتێـك گوتـی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٨٦ ﴾ یوسف.. یوسـفو بنیامیـنو بینایـی چاوانیشی گەڕانەوە!

تۆش کارەکانت بسپێرە بە خودا، داوای دەروازەی خێرو سروەی شادیو بەختەوەری لێ بکە، بڵێ خودایە: «أرزقني كُلَّ ما أتمنى، وفوق ما أتمنى، واجعل الخَير في أمانيَّ»..

خودایە هەموو خۆزگەو ئاواتەکانم پێ ببەخشەو هەموو ئاواتەکانم بەخێر بگێڕە.

خودایە ئەگەر زۆربەی مرۆڤەکان پشتیان تێکردم، تۆ کەسێکم بۆ بنێرە خەندە لە نێو دڵمدا بڕوێنێ، نەك تەنها لێوم!

خودایە من ئیدی هۆگری یادی تۆمو تۆش بە لوتفی خۆت ئەم بەندە گوناهبارەت فەرامۆش مەکە!




هەست بە غوربەتێکی تاڵ دەکەم، سەدای گریانێك لە سینەمدا پەنگی خواردۆتەوە، ئاگر لە دەروونم بەردەدا....

لە دوای نوێژی شێوان لەسەر بەرماڵەکەم بە کزی دانیشتوم‌و دەستی نزاو پاڕانەوەم ڕووەو ئاسمان بڵند کردووە! بە تەنێ ڕووگەی دڵم خوداوەندە، تەنها نووری هیوام سۆزی ئیلاهییە!

## نامەی بیست و هەشت

ماموستا......، زۆر دڵتەنگو نیگەرانو بێ حەواسم، دەمەوێت لە دەوروبەری خۆم جودا ببمەوەو لە هەموو مرۆڤەکان دوورەپەرێزبم، ژیان ڕەنگی لەبەرچاوم بزڕکاوەو، هەست بەو باقو بریقەی ناکەم کە باسی لێوە دەکەن!

دەنگی مرۆڤەکانو قاقای تاڵو، ژاوەژاوی دونیاپەرستیو جیهانی مادده ئازارم دەدەن، هەستدەکەم ژیان بووەتە بازنەیەکی بەتاڵ، مرۆڤەکان ڕۆژانە سوڕانەوەی خۆیانی تێدا دووبارە دەکەنەوە!

دەمەوێت لە کۆڕو مەجلیسەکان هەڵێم.. نامەوێ بەیتو باڵۆرەی ئەم ڕۆژگارە ببیسم!

من چی بکەم؟ هەموو کەسەکان، هەموو شتەکان، هەوڵدەدەن لە خودای گەورەم وەدوورخەنەوە!

نامەوێت ببمە بووکەشوشەی دەستی شەیتان!

نامەوێت گیرۆدەی نەفسی ئەممارەو ئارەزووەکان بم!

نامەوێت لە شەوەزەنگی غەفڵەتدا، مەستو سەرگەردان بم!

دەمەوێ بەرەو ئاسمان هەڵکشێم، ڕۆحم پاك بکەمەوەو پەیوەندیم لەگەڵ خودای خۆمدا پتەوبکەم، دەزانم گەورەیی خوداوەند پێویستی بە سەلماندن نییە، ئەوە منم پێویستم بە سەلماندنی خودی خۆم هەیە لە لای خودا!

من چیدی نامەوێت لە نێوان دوڕیانێکدا سەرگەردان بم، من دەمەوێت تەنها بەندەی خودابم، شەیداو مەستی ئەوینی ئەو بم، جگە لە گەیشتن بە ئەو هیچ ئاواتێکم نەمێنێ!!

نازیـــزم.. ئەوەی تۆ دەتەوێت کەماڵی عەقـــڵو تەواوی ژیری تۆیە، گەواهی نووری ئیمانو خۆشەویســـتیو بەندایەتییەکی ڕاســـتەقینەیە بـــۆ خـــودای میهرەبان! دۆزینـــەوەی ڕێگای بەختەوەریو ســـەرفرازی حەقیقییە، دۆزینەوەی بەهای خودو حیکمەتی وجودە..!

ئیبنولقەیم دەفەرمویت:

فَلِواحِدٍ كُن وَاحداً في واحدٍ   أَعني سَبيلَ الحَقِّ وَالإِيمان

واتـــە: بۆ یەکێك کە خودای تاكو تەنهایە، یەك ڕووگە بە لەســـەر ڕێگایەك کە ڕێگای ئەهلی حەقو ئەهلی ئیمانە!!

تۆ دەتەوێت بچیتەوە سەر ڕێگای ڕاست، تۆ بۆ لای کارێك گەڕایتەوە، کە هەمووومان فەرامۆشـــمان کردووە، ئەویش تاکـــە فەرمانی خودایە، هەرکەســـێك ئـــەو کارەی لەیاد بچێت، ئیدی هـــەزار کاری دی ئەنجام بدات، کەڵکی نییە!

ئەو کارەی بە ئێمە ڕاسپێردراوە لە لایەن خودای تەعالاوە، هەڵسانە بە تەواوی عبودیەت بۆ خودا.. ئەوە گرنگی ئێمەیە لە بووندا، ئێمە بۆ خواردنو خواردنەوەو کەیفو سەیرو سەفا، دروست نەبوین!!

هەربۆیە کاتێك ئەرکی ســـەرەکیمان، لەیـــاد دەچێت، ئیدی بەهای خۆمان لە دەستدەدەین، ئیدی کارەکانمان، ژیانمان، زیندەگیو ڕاحەتمان، وەکـــو دەنکی تەزبیحێك هەمووی لێـــك دەترازێت، چونکە ئەو کاتەی کە نزیکی لە خوداوەند لە دەستدەدەین، ئیدی هەموو خۆشییەکان لە دەستدەدەین، ئیدی بێکەس دەبین، لەگەڵ خودی خۆشماندا ئەغیارین!

بـــەڵام ئەو کاتەی بـــە تەواوەتی دەبینە بەندەی خـــودا، تێکەڵ بە

بەندایەتـــیو مەحەببەتی ئیلاهی دەبینو جگە لە خودا خەیاڵمان بە هیـــچ شـــتێکی دی داگیر ناکەین، هەموو خۆشـــیو لەزەتـــی دونیا بە دەورماندا سەما دەکات.

ئـــەو کاتەی کـــە خوداوەند پێمان دەڵێـــت: «وَلِعَبدي ما سَـــأَلَ»! ئیدی داوایەك نامێنێت جێبەجێ نەکرێت.

دەگێڕنەوە پاشایەك کۆیلەیەکی تایبەت بە خۆی هەبوو، هەر کاتێك ئـــەم کۆیلەیـــە ڕووی لە کۆشـــك دەکرد، ئەهلی حاجـــات وردە کاغەزو ئەرزوحاڵی خۆیانیان دەخســـتە نێو دەســـتی، بەڵکو لای شـــا نمایشـــی بکاتو داواکانیان جێبەجێ بکرێت.

بەندەش نامەی داواو سکاڵاکانی دەخستنە نێو باخەڵ و کیفەکەی، بەڵام کاتێك بە دیداری شای خۆی شاد دەبوو، نەیدەتوانی خۆی لە بەر جەماڵی ئەودا ڕاگرێ، بەڵکو یەکڕاست لە هۆش خۆ دەچوو!

پاشاش دەستی دەخســـتە نێو کیفو باخەڵو کەشکۆڵی کۆیلەکەیو دەیگوت ئەم کۆیلەیەی من کە مەســـتی جەماڵی منەو لە ئەوینی مندا خودی خۆی وەبیر نەماوەو هۆشێکی لەبەرنییە، دەبێت چی پێبێت؟!

کاتێـــك نامەو عەرزوحـــاڵو پارچەکاغەزەکانی دەبینـــی، فەرمانی دەکرد بە جێبەجێکردنی هەموو داواکانو هەر لە پشتی داواکارییەکان بە دەستی خۆی ئیمزای دەکردنو دەیگێڕانەوە شوێنی خۆی!

بـــەو شـــێوەیە داوای هەموویانـــی جێبەجێ دەکـــرد، بێئەوەی کە کۆیلەی شـــەیدا نمایشـــی بکات لە خزمەت شادا، بە جۆرێك کە هەموو داواکانـــی بە زیادەوە بـــۆ جێبەجێ دەکردنو زێتر لـــەوەی خوازیاری

بوون دەستیان دەکەوت!

بەڵام ئەو بەندانەی کە هۆشـــیار بـــوونو بە زمانی خۆیان عەرزی حاڵی ئەهلی حاجاتیان دەکرد، بە زەحمەتو زۆر بە دەگمەن داوایەك یان دوانیان بۆ جێبەجێ دەکرا.

«وَلِلّٰهِ المَثَلُ الأَعلَى» «گەورەییو نمونەی بەرزی بۆ خودا»......

ئەگەر بەندەیەك وەها ڕووی دڵی بکاتە خوداو جگە لە پەیوەســت بوون بە ئەوەوە هەموو شــتێك فەرامۆش بکات، ئەوا هەموو کارەکان مەیسەر دەبێت.

خوداوەنـــد ئاگاداری هەموو ڕازو نیـــازو خۆزگەو ئاواتێکی ئێمەیە، ئەوەی دەمانەوێت بە زیادەوە دەمانداتێ!

بۆ خودا جگە لە ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ هیچی دی تێناچێت!

دەردی دڵی ئێمە وا لە کوێو، ئێمە لە کوێ بۆی دەگەڕێین؟!

بەڵام کوا ئەو بەندەیەی کە جگە لە خودا٦ هیچ ڕووگەیەکی نییە!

ئیبراهیمـــی ئەدهەم دەڵێت: جارێك کۆیلەیەکم کڕی لێم پرســـی: ناوت چییە؟

گوتی: هەرچی تۆ پێت خۆشە!

گوتم: ئەی چی دەخۆیت؟

گوتی: هەرچیم پێ بدەی، من ئەوە دەخۆم!

گوتم: ئەی چی دەپۆشیت؟

گوتی: چی بەرگێکم پێ ببەخشی، من ئەوە دەپۆشم!

گوتم: ئەی چی کارێك دەکەیت؟

گوتی: هەرچی کارێك تۆ فەرمانم پێ بکەی، ئامادەم ئەنجامی بدەم!

گوتم: ئەی چی داوا دەکەیو ئاوات بە چی دەخوازی؟

گوتی: داواکردنو خواستن چی پەیوەندییەکی بە منی هەژارەوە هەیە؟!

ئیبراهیـــم دەڵــێ بە خۆم گــوت: تۆ ئەی داماو لــە هەموو ژینتدا ساتێك لەگەڵ خودای خۆتدا، ئاوها مامەڵەت کردووە؟!

بەردەوامبـــە ئازیزم، لەو ڕێگایە ڕاســـتتر نییـــە کە لە خوداوەندت نزیك دەکاتەوە!

لەو دڵە هۆشیارتر نییە، کە مەستە بە حوببی ئیلاهی!

لــەو چاوە ڕووناکتر نییە، کە ئەســـرین بۆ هەیبـــەتو عەزەمەتی خودا هەڵدەوەرێنێ!

هاودەمیی بێکارو وێڵو سەرگەردانەکان مەکە...

جگە لەلای خوداوەند، لە هیچ شوێنێ، بۆ بەختەوەریو سەرفرازی مەگەڕێ، لەبەردەم دەرگای خودای گەورەو میهرەباندا نەبێت هەرگیز ڕامەوەستە...

جگە لە خەزێنەی ئیلاهی، چاوت لە دەستی کەس نەبێت..

گەیشـــتن بە خودا گەیشـــتنە بە هەموو ئاواتو خۆزگەوهیواکان ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾ الزمر: ٣٦

ئیدی با هەوڵدەین بەڕاستی «عەبدی» «الله» بینو بەس!

پروشـــەی وردە بارانێکی هێمن بوو، بەرەو نوێژی شێوان هەنگاوم دەنا، دەنگـی بانگەکـە نەوایەکی حەزین بـوو، دەتگوت ئەویش هەسـت بە دوا ڕۆژەکانی بەهارو نزیکبوونەوەی وەرزی گڕەو گەرمای هاوین دەکات.

بارانەکە لە فرمێسـکی ماڵاوایی دەچـوو، وەکو ئەوەی بڵێت ئیدی تـا پاییزێ ناتانبینم! دەزانـم گڕی دوور لە ناخەوە دەتان سـوتێنێ وەلێ خودا ياربێت، جارێکی دی بە دیداری یەکتر شـاد دەبینو پڕ بە سینگتان بۆنی باران دەکەن!

لەوێـدا دیمەنی پەیامبەری ئازیزم هاتە پێش چاو، ئەو ئەویندارە شـەیدایە چۆن بەرۆکی دەکردەوە، بۆ پروشەی یەکەم ڕێژنەی بارانو دەیگـوت: ئەو دڵۆپانە تـازە لە لای خوداوەنـدەوە هاتوون، چوون لە ئاسمانی ئەوەوەو بە فەرمانی ئەو دێنە خوارێ!

ئەو پەیامبەرەی هەمیشـە، ڕووی دڵو چاوو دەستو هەستی لە ئاسمان بوو، سڵاو لە بەرۆکێك ئەسرینی زەویو ئاسمانی تێدا جەم بووە!

سـاتێك بـە ئایەتـی ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٠

تەڕدەبێتو ساتێکیش بە فرمێسکی هەورە سپییەکان!!

بێ ئیرادەی پێش وەخت لە نوێژدا سـورەتی (حجرات)م خوێند، لە ڕکاتی دووەمدا کە گەیشتمە ﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ ﴾ الحجرات

هەسـتکردن بـە غوربەتێکی تاڵ گـەرووی تاسـاندم، دەبێت چی بەهەشتێك بووبێت ئەو شارەی کە پێغەمبەر تێیدا بووە؟

دەبێت وجودی ئەو دڵە سپییە چی وجودێکی هەبووبێت؟

ج خۆشییەك ڕووی لە کەسانێك کردووە کە بەیانیو ئێواری، چاویان بە سورمەی دیداری ئەو نازدارە ڕشتووە!

ج حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەسفی بە مەخموری
کە چاوێ سورمەکێشراوی خودایی بێ لە کل ج بکا؟ -مەحوی-

لە هاتنەوەمدا خەمێکی سەیر باڵی کێشا بەسەر دڵمدا، بەزەیم بە حاڵی خۆمدا هاتەوە، من لە کوێی مەقاماتی بەندایەتی بۆ خوداو موتابەعەکردنی پەیامبەردام (دروودی خودای لێبێت) پەیوەندیم لەگەڵ خودا چۆنە، وەکو بەندەیەکی بچووك لەگەڵ خودایەکی گەورەدا چۆن مامەڵە دەکەم؟!

ئێمە لە زەمەنی ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ﴾ دا نەژیاین، نەمانتوانی لەسەردەمی پێغەمبەرستانو مەدینەی مونەوەر، بە نووری نبوەتدا بژین!

نەماندەتوانی یەکێك بین لەو هاوەڵانەی قوتابخانەی محمدی بینو لەسەر دەستی ئەو پەیامبەرە ئازیزە هێندە بەهرەمەند بین، لە نووری پەیامەکەی کە «مەحوی» لە وەسفیاندا دەڵێت:

بە نووری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بوو بوون
غەریبی تازە هاتووە دەیوت: ئەم پێغەمبەرستانە

وەلێ خۆ پەروەردەی ئەو پێغەمبەرە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتە جوانەکانیدا نەخشێنراوە!؟ ئەو وەسفەی کە دایکە ئایشێی دایکی باوەڕدارانو خۆشەویستی پێغەمبەری نازدار وەسفی کردووە لە نێوماندایە «كانَ خُلُقُهُ القُرآنُ»!

خۆ ئەو دوای خۆی نێمەی فەرامۆش نەکرد، ڕۆژی دوایش پێش هەموومان دەگاتە گۆڕەپانی مەحشەرو لەسەر حەوزی شەریفی چاوەڕوانمان دەکات!

ئەو پێغەمبەرە خۆشی دەویستین، لە دوا چرکەکانی ژیانیدا بۆ دووریمان فرمێسکی ڕشتو، بۆ میهرەبانیو سۆزی ئیلاهی نالەی نزای بەرەو کردگار بڵند کرد! چی باوەڕدارێك سەدای «أمتي أمتي» لە نالەی گوێچکەیدا نازرنگێتەوە!؟

تا ئەو کاتەی ئەم دونیا فانیەی بەجێهێشت ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ۝٩٩ ﴾ الحجر: ٩٩ دروشمی بوو، لە مەداریجی عبودیەتدا بەرەو لای خوداوەند هەڵدەکشا!

بە هاوڕێکانی دەگوت: «كُن في الدُنيا كأنَكَ غريبٌ أو عابِرَ سبيل»

تا هەمیشە وەکو نامۆیەك بە ژیانو ڕێبوارێکی کاتی مامەڵە لەگەڵ دونیادا بکەن!

لاوێکی وەکو عەبدوڵای کوڕی عەباس بانگ دەکاتو لەسەر بیروباوەڕێکی پتەو پەروەردەی دەکاتو پێی دەفەرموێت: ئەی کوڕی لاو فەرمانەکانی خودا بپارێزە خودا دەتپارێزێت، چاودێری فەرمانی خوداوەند بکە، ڕووت لە ئەو بێت، ئەویش هەمیشە ڕووی لێت دەبێت.

هەرکات داوات کرد، تەنها لە خودا داوا بکە، داوای کۆمەك تەنها لە ئەو بکە، دڵنیاشبە ئەگەر هەمو خەڵکی کۆببنەوەو بیانەوێت سودێکت پێبگەیەنن ناتوانن، جگە لەوەی خوداوەند بۆی دیاری کردووی، هاوکات ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوەو بیانەوێت زیانێکت پێ بگەیەنن،

نیوەن جگە لە کارێك کە خودا دەیەوێت توشت بێت! قەڵەمی قەدەری خودا هەڵگیراو میدادی پەڕاوی قەدەر وشکبوونەوە!

ئازیزم: گەر پرسیارێك لە خۆمان بکەین: ئایا ئێمە لەم وەسیەتو ئامۆژگارییەی پێغەمبەر «دروودی خوای لێبێت» چەندمان جێبەجێ کردووە؟

تا چەند دڵمان بە خوداوەندەوە بەندەو بە تەواوی تەسلیم بووین، تا چەند دڵمان داوەتە دەستی خودا، چەندە متمانەمان بەهێزو دەسەڵاتی خودا هەیە، بە گوفتار نا، بەڵکو بە کردار؟!

تا چەند هەموو داواکانمان بۆ لای ئەو بڵند دەکەین! تا چەند چاوەڕوانی فەرو فەزڵو میهری ئەوین؟ تا چەند خوداوەند وەکیلی سەربەخۆی هەموو کارەکانمانە؟

تا چەند هەموو کارەکانمان سپاردووە بە ئەو؟!

تا چەند ئاسودەو دڵنیاین.. چەندیش نیگەرانو خەمبارو نارەحەتو بێوازین؟

ژیان لەگەڵ خودا ئازیزم، بەهەشتی ڕۆحە، کانیاوی سەرفرازیو نۆخژنی دڵە، ڕزگاربوونە لە ترسو لەرزو دڵەڕاوکێو خەمو پەژارە!

ناسینی خوداو ئاشنابوون بە هێزو دەسەڵاتو ناوە جوانو سیفەتە بەرزەکانو، ڕازیبوون بە قەزاو قەدەری ئیلاهی، تاکە ڕێگای ئاسودەییو سەعادەتی سەرمەدییە لە ژیاندا، گەر دروشمت ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ١٧٣﴾ آل عمران: ١٧٣ بێت، ئیدی وەکو ئیبراهیم خۆت فڕێدە نێو ئاگرو مەترسێ!

وەکو پەیامبەری نازدار بەرەو ڕووی هەموو مەترسیەکان دەبیتەوە،

نەك ناترسی، بەڵكو متمانەت بە وادەی خودا بەهێزتر دەبێت ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾﴾ آل عمـران: ١٧٣ پێغەمبەرەكەت پەروەردەی ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾﴾ النساء و ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾﴾ النساء، و ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾﴾ە بۆیە دڵارامیو هێمنیو خەندەی نووریـنی سەر لێوە جوانەكانی، هەمیشە هاودەمی بوون..

ناچـارم بەجێت بێڵمو نامـەی ئەم جارەم لێرەدا كۆتایی پێ بێنم، وەلێ بەڵێنت پێ دەدەم بە ویستی خودا، ئەگەر تەمەن باقی بێت، زێتر لەبارەی «توكل» بدوێم، تا ئەو كاتە بە خودای باڵادەستت دەسپێرم.




# نامەی سی

لە کۆتایی نامەی بیستو نۆیەمدا لە باسی (توکل)دا ماڵاواییم لێکردیت، بەڵێنم پێدای زێتر لەو بارەیەوە بۆت بدوێم..

ئازیزم (توکل) بە ئۆخژنی دڵو ئۆقرەی ناخو ئاسـودەیی هەسـتو ئەسـتی مرۆڤـی خوداویسـتە! ئـەو کاتەی مـرۆڤ جلـەوی هەموو کاروبارەکانی خۆی ڕادەسـتی خوداوەندی گەورەی دەکاتو هەموو ڕازو نیـازو حەزو ئاواتەکانی بەو دەسـپێرێ، ئیـدی دڵنیاو بێخەم دەبێت! ئەو کاتەی کە دەزانێت کارسازی کارانو توانای تواناداران و شاهەنشاهی هەمـوو مەملەکەتان، تەنها خودایـەو بێ فەرمانی وی، هیچ ڕوونادات کەس ناتوانێ پەنجەی وەئاوێ ڕابکا!

دەزانێ چ ژیرییەکی کردووە، کاتێك بە تەواوی تەسلیم بوون خۆی ئەسپاردەی پەروەردگاری خۆی کردووە!!

پێشـینان دەڵێن: هەرکەس دەیەوێت بەهێزترینی مرۆڤەکان بێت، با (توکل) بە خودا بکات.

بەنـدەی (مُتَوکِّل) هەمیشـە تەنها چاوی، لە دەسـتی خوداوەندو دڵی پەیوەسـتە بە میهـری ئیلاهییەوە، چوون دەزانێت خـودای خێرۆمەندو بەخشندە، جگە لە خێر هیچی دی بۆ بەندەکانی قەرار نادات.

ئەگەر بە نەزەری ئێمە، ڕووداوێك پێچەوانەی حەزی ئێمە بێو بەباشی نەزانین، ئەوە لە عیلمی غەیبی خودادا تەواوی سـودو کەڵکە، وەلێ ئێمە پەی بە حیکمەتی ئیلاهی نابەینو ڕازی ئەو کارە لای ئێمە پەنهانە!

گەیشتن بە مەقامی تەوەککول، ئاوڕنەدانەوە بۆ ئەسبابو دەوروبەرو دڵنیابوون، لە هەموو جۆرە ڕووداوو کارەساتەکانی ژیانو، فەرامۆشکردنی خەمی ڕزقو ڕۆزیوماڵو منداڵو وەسایلی ژیانو زیندەگی، خاڵیبوونی دڵو دەروون لـە ترسو لـەرز، لە غەیری خوداو، پەیوەسـتبوونی دڵ

تەنها بە ئەوینی خوداییەوە، کارێکی سانا نییە ئازیزم...

بە زار دەیان جار دەڵێین: ﴿تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ﴾، بەڵام دڵ لە بازاڕەکانی دونیادا خەریکی سەودایە! ئیدیعای ڕێزوانی ئیلاهی دەکەین!

بەڵام ئەوەندەی خەریکی ڕازیکردنی بەندەکانین، ئەوەندە خەمی ڕازیبوونی خودا خەیاڵی داگیر نەکردووین!

وای لەوەی لە ڕازی ڕازیکردنی خوداوەند تێگەیشتووە، چەند بەختەوەرو بێ خەمە!

چونکە (إذا جَعَلْتَ رِضَى اللهِ هَمَّك، تَكَفَّلَ اللهُ بِكُلِّ ما أهَمَّك).

گەر ڕازیبوونی خودا خەمت بێ
گشت خەونەکانت لای خوا جەمەبێ!

خۆ هەموو مرۆڤەکان دوای مردن دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە لە ژیانماندا بگەڕێینەوە بۆ لای خوداو پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاری خۆماندا پتەوبکەین.

بۆ ئەم کارەش دەبێت مەسەلەی پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ خودادا پرۆژەی تەمەنمان بێت، هەموو عومرمان هەنگاونان بێت بەرەو لای خودا، موسا ئاسا پەلە بکەین تا ڕازیبوونی خوداوەدەستخەین ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾ طـه: ٨٤، خۆمان بۆ ئەم کارە یەکلایی بکەینەوە..

چیدی لە ئادابی بەندایەتی بێ ئاگا نەبین و سالیکی ڕێگای بەهەشت بین بە حەقیقی!

ئیدی تەماشای دەوروبەرت مەکەو لە زۆرینەی بەهیلاك چووان

ســەرت ســوڕنەمێنێ (لا تَقُلْ لِمَن هَلَكَ، كَيفَ هَلَكَ؟ ولكن قُلْ لِمَن نَجى، كَيفَ نَجى؟) بەو کەســە مەیَــژە کە بە هەلاکەت چــوو، چۆن ئاوای بەســەرهات، چونکە ڕێگانی بەهیلاکچوون زۆرن، بەڵکو بەو کەسە بڵێ کە ڕزگاری بوو، لە ئاشوبی دونیا، چۆنی نەجات بوو؟!

ئازیــزم: کاتێــك ئەم نامەیــەت دەگاتێ، لــە ڕۆژانــی ئەوایلی مانگی موبارەکی ڕەمەزانداى، لێوت وشكو سیمات ماندوو، زارت بە خوێندنەوەی ئایاتی فورقان پاراوە، لە چاوەڕوانی فەرحەی یەکەمی ئێوارێ دای.. لەگەڵ یادگارییە خۆشــەکانی ڕەمەزاندا لە کەژاوەی بەندایەتیدا وانەی ئەوینی خودایی دەخوێنیو بەدەم هەنیســكو گریانو تەوبەو داوای غوفرانەوە، هەست بە گەورەیی لەزەتی ئیمانو بچوکی دنیای فانی دەکەیت!

ڕەمــەزان هەلێکــی زێڕینــە بۆ ئاشــتبوونەوە لەگــەڵ خوداوەندی میهرەبانــدا، لەوێدا دەتوانین تۆمارێکی نــوێ بۆ بەندایەتی بکەینەوە، ئێواران لە دەرگای لوتفی ئیلاهی بدەینو، لەسەحەریشدا بە دڵی شکاوو چاوی پڕ ئەســرینو ڕووخساری شەرمندەوە داوای لێخۆشبوون بکەینو بگەڕێینەوە نێو دەڤەری نوورو، دەریای زیوینی میهرو بەزەیی خودایی..

کۆتایــی بــە یاخیبــوونو دووری لــە خوداوەند بهێنیــن.. هەموو بەندەکان پۆل پۆل ئێواران، لەگەڵ بەربانگدا دێنەوە نێو سنووری بێ ســنووری نوور.. دەرگاکانی خوداوەندیــش والان، ئێمەش لە ژێر باڵی ڕەشــی شــەوا، بە شــەرمەوە خۆمان دەکەینە نێو ئاپۆڕەی تۆبەکاران، بەڵکو خوداوەند لێمان ببورێو لاپەڕەی سیای گوناهمان بسڕێتەوە!!

بەو هیوایەی لە دوعای خێرت، وەك هەمیشە بێبەشمان نەکەی!!






# نامەی سی و یەک

لە دوای دوا نامەم، کە دەکرێ ئەو کات هێشتا بە دەستت نەگەیشتبێ، چاوەکانــم دایانــە ئێشو ئــازار، تارمایی ڕەش بیناییــان داگرتمو لە جیهانی نوورەوە بەرەو جیهانی تاریکی بارگەم لێکنا، لە چەند ساتێکی کەمدا لە یەکێك لە گەورەترین نیعمەتەکانی خودا بێبەش بووم!

ئەوسا بە تەواوی زانیم جیهانی نوورو جیهانی زولومات چەند جیاوازن! ئەوکات زانیم بیناو نابینا هەرگیز چوون یەك نین!

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ﴾ الرعد: ١٦

ئەوکات زانیم خودا بۆچی دەفەرمویت ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ﴾ البلد: ٨

ئەوکاتەی دنیای ڕوناکم تاریك بوو!

چەند بێ ئاگایــن لە نیعمەتەکانی خودا، تا خوداوند غافلگیرمان نەکاتو لێمان وەرنەگرێتەوە!

دەتوانی ژیانت وێنا بکەی بەبێ نیعمەتی چاو!؟

دەتوانی لە بینینی خۆشەویستانو دۆستانت مەحروم بی؟!

ئیدی جوانییەکانی گەردوون نابینی! بەهارو پایز لای تۆ چوونیەکە!

لە بینینی لاپەڕەکانی «قورئان» بێبەش دەبی!

ئای چی ڕوویەك لە ڕوخساری لاپەڕەکانی موصحەف جوانترە؟!

ئەنەس لە باسـی دوا دیداری پێغەمبەردا دەفەرموێ «ﷺ»: کاتی ئێمە لە نوێژی نیوەڕۆدا بووین، پەیامبەر پەردەی ژوورەکەی لاداو بە زەردەخەنەوە تەماشای کردین!

ئێمـەش لە حەیوەتی دیداری ڕوخسـاری، ئاگامان لە خۆمان نەما، ڕوخساری هێندە جوان بوو!!

دەتگوت پەڕەی موصحەفە! ئیدی ئەوە دوا دیدار بوو!.......

هـاوکات سـەرەتای مانگی پیـرۆزی ڕەمەزان بـوو، دەمێك بوو لە چاوەڕوانیدا دەسـتەو ئەزەر ڕاوەسـتابووم، بەڵام کاتێ ئەو تەشریفی هێنـا، مـن نەمتوانی تێر بـە چاوەکانم تەماشـای هیلالەکەی بکەم

نەمتوانی بە سورمەی لاپەڕەکانی قورئان، دیدەم سورمە ڕێژ بکەم!

گوێبیستی قورئان دەبووم، بەڵام من بە تاسەی دیداری لاپەڕەکان بووم، دەمویست ئاوێزانی پیتەکانی ببم!

نەمدەتوانی تەماشای ڕووناکی بکەم، لە دیوێکی تاریکا ڕۆژم بەسەر دەبردا ﴿ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾ النوور، ٤٠

دەیان ساڵە بەو چاوە دەبینم، لە بەرامبەریدا چیم بۆ سوپاسی خودا کردووە؟!

﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۖ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾ الملك، ٢٣

نەمانتوانی لەو کەمە سوپاسگوزارە بین!؟

چاو دوڕیانێکە بۆ دوو مەنزڵ!

ئارەزووو بکەی دەتبا بەرەو ڕەوح و ڕەیحانی بەهەشت!

وە گەر نا بەرەو چاڵو دۆڵەکانی دۆزەخ!

دەتوانی بە فرمێسکەکانی چاوت، گەردنی خۆت ئازاد بکەی، خوداوەند بڕوانامەی بەهەشتت پێ بدات.

پەیامبەر دەفەرموێ «دروودی خوای لێبێت»: سێ کەس چاویان دۆزەخ نابینێ، چاوێك لە ترسی خودا ئەسرینی ڕشتبێ، چاوێك لە پێناوی خودادا پاسەوانی کردبێ، چاوێك بەرامبەر ئەو شتانەی حەرامە پێڵوەکانی داخستوون». معجم الطبراني-صحيح-

هەروەها دەفەرموێ «ئەوەی لە ترسی خودا گریابێ ناچێتە دۆزەخ تا شیر نەگەڕێتەوە بۆ گوان»! الترمذي صحيح

وەلێ لەم زەمەنی فیتنەیەدا چۆن چاوەکانمان بپارێزین!!

لــە زەمەنێکدا زۆرترین تــاوان بە چاو دەکرێت، جلەوی واڵاکراوەو لەبری سوپاسگوزاری بۆ خودا بۆ تاوانو گوناهـو حەرام بەکاردێت!!

مەگــەر ئێمــەی موســوڵمان فەرمانــی خودامــان بیرچــووە.

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ النور: ٣٠

لەگەڵ سورەتی نوورا، چۆنین؟ چەند لەو نوورە بەهرەمەندین!

محمدی کوڕی واسیع زۆر سەردانی هاوڕێیەکی دەکرد، هەموو جارێ کەنیزەکێك دەرگای بۆ دەکردەوە، ئەویش سەری دادەخستو چاوی دەنووقانــد، کاتێــك کەنیزەکەکە دەگەڕایەوە بــۆلای خاوەن ماڵ، لێی دەپرسی: کێیە؟ ئەویش دەیگوت: هاوڕێ کوێرەکەتە!

وای دەزانی کوێرە!

چونکە دەیزانی چاو ئەگەر بەربەستی ئیمان نەبێ چەند دژوارە!

كُلُّ الحوادثِ مَبدأُها مِنَ النَّظَر    وَمُعظَمُ النّارِ مِنْ مُستَصْغرِ الشَرِرِ
كَمْ نظرةٍ فَعَلَتْ في قَلبِ صاحِبِها    فِعْلَ السِّهامِ بلا قوسٍ ولا وَتَرِ

چونکە نەزەر تیرێکی ژەهراوییەو دڵو دەروونەکان ژەهراوی دەکات.

دەریای ئیمان لێڵ دەکاتو خونچەی توهرو عەفاف دەوەرێنێ!!

بەڵام ئەوەی چاوی بپارێزێ، خودا شیرینی ئیمان بە دڵو دەرونی دەبەخشێ!

حەســانی کوڕی ئەبی سینان، لە ڕۆژی جەژنا پێیان گوت: هەرگیز هێندەی ئەمرۆ ئافرەتمان نەبینیوە؟!

گوتــی: بەڵام من چاوم بــە یەك ئافرەت نەکەوتووە! چونکە چاوی

خۆی پاراستبوو!

کاتێك گەڕایەوە ماڵێ: ژنەکەی لێی پرسی: چەند ئافرەتی جوانت بینی؟!

گوتـــی: وەڵڵاهـــی تا گەڕاومەتـــەوە، جگە لە پەنجەکەڵەی دەســـتم تەماشای هیچم نەکردووە!

ڕەبیعی کوڕی خوســـەیم، بەلای کۆمەڵێـــك ئافرەتا تێپەڕی، هێندە تەماشای زەوی دەکردو خۆی پاراست: ئافرەتەکان وایانزانی کوێرەو لە خودا پاڕانەوە لە کوێری بیانپارێزێ!

ســـوفیانی ســـەوری، لە کۆتایی وانەکانیدا پێش ڕۆژی جەژن گوتی: یەکەمین کارێك کە لە ڕۆژی جەژندا دەیکەین، پاراستنی چاوەکانمانە لە ڕوانینی حەرام!

نازیزم: ڕۆژانە هەزاران جار، چاوەکانت دەتروکێنی!

لە خۆت پرســـیوە چەندیان بۆ ڕەزامەنـــدی خودایەو چەندیان بە پێچەوانەوە؟!

لـــە خۆت پرســـیوە کە ئایـــا دەتوانی بەرامبەر بە هـــەزاران تاوانی ڕۆژانەی چاوت خۆت ئامادەکەی بۆ سزای خودا!

هەوڵدەدەیـــت ئەو چاوانەی، کە دەتەوێت لـــە ڕۆژی دوایدا خودای گەورەی پێ ببینی، بە پاکی ڕایانگریو لە ڕۆژی دوایدا شەرمەزار نەبیو بـــە شـــانازییەوە بە دیدەی پاكو بێگەردەوە بۆ خودای خۆشەویســـتی خۆتی پێ بڕوانی!؟

دەزانی خوداوەند ئاگای لە هەموو تیلەیەکی چاوت هەیە؟!!

﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩




# نامەی سی و دوو

ئازیزم: وتەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی عەون زۆر سەرنجی ڕاکێشام کە دەڵێت: ئەگەر کەسێك هەموو کارەکانی بە یەکێك لە پاشاکانی دونیا بسپێریۆ خۆی تەسلیمی بکات سودمەند دەبێت، ئەی ئەگەر کەسێك خۆی تەسلیمی خودایەك بکات کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو پەروەردگاری هەموو بونەوەرەو ئەوەی لەژێر گڵیشدایە موڵکی ئەوە!!



Scanned by CamScanner

لەم زەمەنی ئاشوبو نارەحەتیو گرفتارییەدا، بەندایەتی بۆ پەروەردگارو پتەوکردنی پەیوەندی، تاکە هۆکاری دڵنیاییو ئارامیو سەعادەتە!

﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الأنعام: ١٦٤

نا، هەرگیز ئێمەی بەندە، دوای خوداوەندی خۆمان بۆ پەروەردگارێکی دی ناگەڕێین، دوای ئەو خودایەی کە پەروەردگاری هەموو بونەوەرێکە! ئیدی ئێمە ئاتاجمان بە کەس نییە جگە لە ئەو!

(تەوحیدی ربوبیەت) واتە: یەکتاپەرستی پەروەردگار، فێرمان دەکات کە خودایەکی گەورە، پەروەردگارێتی لە هەموو جیهان دەکات، بە تەواوی هەموو مەخلوقاتو هەموو بوونەوەرەکانییەوەو جڵەوی هەموو کارەکان، تەواوی ڕووداوەکان، تەنها بەدەستی ئەوەو بەس!

لەو ڕۆژەوە دڵۆپەیەك ئاوین، خوداوەند بە لوتفی خۆی چاودێریمان دەکاتو پەروەردەمان دەکات، هەموو بەدیهێنراوەکان، لە پەروەردگاری خوداوەند هیدایەت وەردەگرن، بۆ زیندەگیو ژیان.

پێش ئەوەی بێینە سەر زەوی، گویو چاوو دڵو هەستی پێ بەخشیوین، کە ئەو کات ئێمە نە پێی دەبیستینو نەپێی دەبینینو نە هەستی پێ دەکەین!

وەلی لەگەڵ هاتنمان بۆ سەرزەوی هێدی هێدی ئەو وەسایلانە دەکەونەکار! هەر دوو سێ ڕۆژەو ئیدی چاو بە نێو ماڵدا دەگێڕین، لە بچوکترین دەنگ وەئاگادێینو لە خەو وەخەبەردێین!

چەند حەوتەیەکەو ئیدی دایەو بابە دەناسینو هۆگریان دەبین!

پاکیو بێگەردی بۆ خوداوەند..

﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل: ٧٨

پەروەردگاریتی خوداوەند، واتە خالیقو مالیکو مودەببیرە!

خالیقو بەدیهێنەرو بنیاتنەرو، دروستکەری هەموو بەدیهێنراوەکانە.

هەر ئەویش خاوەنداری، لە هەموو موڵکو سەروەتو سامانی ئاسمانو زەوی‌و، ئەوەی کە تیایاندایە دەکات، ڕزقو ڕۆزی، ژیانو مردن، دەردو شیفا، ماڵو سەروەت، بەرزی‌و نزمی، بوونو نەبوون، دارایی‌و نەداری، تەنها ئەو خاوەنێتی.

هاوکات بەڕێوەبەری کاروباری کەونو کائینات، ڕێکخەری سیستەمی گەردون، تەنها بەدەستی ئەوەو جڵەوگیری هەموو کاروبارەکان تەنها بۆ ئەوە.

لە هەموو ئەم کارانەدا خوداوەند هاوڕێ‌و هاودەمو شەریکێکی نین.

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأعراف: ٥٤ هەربۆیە هەندێك لە زانایان لە پێناسەی تەوحیدی ربوبیەت دا دەڵێن: (هُوَ تَوحِيدُ اللهِ فِي أفعالِه) واتە: بە یەکتادانانی خودایە لە کردارەکانیدا! بەو مانایەی خودا هەرکارێك کە دەیکات بە تەنیا ئەنجامی دەداو کەس هاوفەرمانی ئەو نییە!

خەلقو ئەمرو موڵکو تەدبیرو، فەرمانو هێزو دەسەڵات تەنها هی ئەون! خودای گەورەش بۆ ئەوەی بەندەکانی باوەڕ بەمە بکەن، هەزاران هەزار بەڵگەی بەرچاوی، خستۆتە بەردەستی بەندەکان، بە شێوەیەك کە لە ژمارە نایەن، چونکە بە هێندەی ژمارەی مەخلوقاتی خودا، کە هەر خۆی ژمارەیان دەزانێ، بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتی

خوداوەند هەیە!

﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ، وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾ الذاريات، ٢٠ - ٢١

﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ ﴾ فصلت، ٥٣

جارێکیان پرسیاریان لە ئیمامی شافیعی کرد سەبارەت بە وجودی خوداو گەورەیی‌و دەسەڵاتی پەروەردگار، ئەویش لە وەڵامدا گوتی:
گەڵای توو!

ئامادەبووان وەڵامەکەیان پێ سەیر بوو، یانی چی گەڵای توو؟!
پێشەوا شافیعی فەرمووی: تەماشاکەن هەمان گەڵای توو کرمی ئاوریشم کە پێی دەگوترێت (قەز)و دەیخواتو دەیکات بە ئاوریشم!
هەنگ دەیخواتو دەیکاتە هەنگوین!
مامزیش دەیخواتو دەیکاتە میسکی بۆنخۆش!
کێ سەرچاوەکەی یەکخستو بەرهەمەکانی جیاوازکرد؟ جگە لە پەروەردگار.
ئەمە تەنها بەڵگەیەکی بچووك لە گەڵای دار توویەك!
ئەی ئەگەر باس لە سێ ئەرکانی ربوبیەت بکەین کە بریتین لە (خەلق‌و موڵك‌و تەدبیر)، بیر لەوە بکەینەوە کە ئەو هەموو ژمارە بێ هەژمارەی بونەوەر، لە مرۆڤو ئاژەڵ‌و باڵندەو ماسی‌و نەهەنگو زیندەوەرانی دەریاو بیابان‌و، ژێرخاك‌و سەرخاك‌و، زیندەوەرگەلێك کە بەچاو نابینرێن، هەموویان ڕزق‌و ڕۆزیان لەسەر پەروەردگارە!
پەروەردگارێکی بەتوانا﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾الذاريات، ٥٨
ڕۆزیدەرێك کە بێ سنوور دەبەخشێ، کەس ناتوانێ، ڕێگری لە ڕزقی ئەو بکات ..﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴾ آل عمران، ٣٧

مولکداری هەموو موڵکو سامانێك هەر بۆ ئەوەو هەموو پاشاو مولکدارو دەوڵەمەندەکان ڕۆژێك دادێ، موڵکو سەروەتی خۆیان جێدێڵن، کە خوداوەند پێی بەخشیون!

ئەوە لاوازی مرۆڤەکانە کە چاویان لە دەستی مرۆڤێکی لاوازی وەکو خۆیانە، تا خەڵاتیان بکات، یان نزاو تکاو پاڕانەوە بۆ شیفاو لابردنی دەردو بەڵا لە دارو بەردی بێ گیان دەکەن، گەنجینەکانی ئاسمانو زەوی تەنها هی خودان!

﴿وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ﴾ المنافقون: ٧

ساڵەهای ساڵە بەڕێوەبردنی گەردونێك بە مانگو خۆرو هەسارەو ئاسمانێك کە ملیۆنەها ئەستێرەی کردۆتە ملوانکەی سنگو گەردنی، جگە لە تەدبیری ئیلاهی کێ هەیە دەستی لەو بەڕێوەبردنەدا هەبێت؟!

﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ یس: ٨٣

﴿قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّن يَمۡلِكُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَمَن يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ یونس: ٣١

پیرەمێردی شاعیریش دەڵێت:

خوایە ئەوانەی کە بێ بـــــاوەڕن هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەرن

ئەگینا ســـــەیری باخێکی گوڵ کەن تەماشایەکی بە ئەقڵو دڵ کەن

ئەو ڕەنگە جوانەی پەڕەی هەرجایی بە زەڕەبینی تیشکی بینایی

لێی وردبینەوە کـــە ئەو صەنعەتە کێ دەڵێ زادەی، خووی تەبیعەتە؟




## نامەی سی و سیٚ[7]

إليكَ وإلاَّ لاتُشَدُّ الركائِبُ ومنكَ وإلاَّ فالمؤمِّلُ خائبُ
وفيكَ وإلاَّ فالكلامُ مَضَيعٌ وعَنكَ وإلاَّ فالُمحدِّثُ كاذِبُ

خودایە، پەروەردگاری مەزن، جگە بۆ لای تۆ، ستەمە کاروان بکەوێتە ڕێو هیواخواز جگە لە تۆ، ئەر هیوای بە کەس بێت، ئەوا تکای بێهودەو داری خۆزگەی بێوەر دەبێ!

سەناو ستایش، تەنها شایستەی تۆیەو، قسەو گفتوگۆ گەر لەبارەی گەورەیی تۆوە نەبێ، بێ کەڵکو بێ سودەو ئەوەی بگوترێ، جگە لە وەسفی گەورەییو بلندی تۆ هەمووی ناڕاستە!

ئازیـــزم: ئەو کاتەی بازاڕی کەســادی، مرۆڤە بچکۆلەکان جێدێڵی‌و ڕوودەکەیتە گوڵزاری بێ سنووری ئیلاهی، لەوێدا ئارامی دەبێتە میوانی هەمیشــەیی دڵ‌و، پڕوشەی بارانی میهری خودایی ڕۆحت دەشواتەوەو، ســـروەی بەزەیی‌و ســۆزی خـــودا، گوڵبارانی باخچەی هیـــواو خۆزگەو ئاواتەکانت دەکات.

کە دەچیتە نێو گوڵستان ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحدید: ٤ ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ﴾ الأنعام: ١٠٣، ئیدی خەم مالآواییت لێ دەکاو دڵەڕاوکێ ئەدرەسی دڵت نادۆزێتەوە!

خۆ ئەگەر لەگەڵ سەروەردا بژی (اللّهمَّ إنّا بكَ وَإلَيْكَ لا مَلْجأَ وَلَا مَنْجا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ) ئەوە ئیدی دڵنیا دەبی کە جگە لە پەناو پەسێرو سایەی ئەو، شوێنێکی دیت نین! هێزێك هەرگیز شکست ناناسێ‌و گەورەیەك کە هەرگیز لە گەورەیی ناکەوێت تەنها (الله)یە!!

بۆ کوێ دەچی ئازیزم، لەم دەڤەری نووره زیاتر شـــوێنێك هەیە بۆ حەوانەوە، پەنایەك هەیە بۆ پشوو، بەهەشتێك هەیە بۆ ڕۆح؟!

ئافرەتێك باوەشی بە پەردەی کابەدا کردبوو دەیگوت: (يا وَحْشَتِي بَعدَ أُنسي، يا ذُلِّي بَعدَ عِزِّي، يا فَقْرِي بَعدَ غِناي)!

پێیـــان گـــوت ئەوە بۆ ئاوا هـــاوار دەکەی، بەڵایەکت لـــێ قەوماوە، ســـەروەت‌و ســـامانێکت لەدەســـتداوە؟! گوتی: ( لا، ولكـــن كان لي قلب فقدته)!

گوتیان: ئەمە بوو ئەو بەڵایەی باســـی دەکەی؟! گوتی: (وَأَيُّ مُصِيبَةٍ أَعْظَمُ مِنْ فَقْدِ الْقُلُوبِ وَانْقِطَاعِهَا عَنِ الْمَحْبُوبِ)!

بێگومان زۆر راستە، چی بەڵایەك گەورەترە لە دابڕانی دڵ لە خۆشەویستەکەی!

دڵی موسوڵمان هەمیشە ئاوێزانی عەرشی ئیلاهییە! پەروانەی دەوری چرای ئیمانو فەرمانی خودایە، جا پێم خۆشە ئازیزم دوای ئەوەی لە نامەی ڕابردوودا لە بارەی (تەوحیدی ربوبیەتەوە) دوام، ئەمجارە لەبارەی (تەوحیدی ئولوهیەتەوە) بدوێم.

ئیبنولقەیم دەفەرموێ:

وَعِبادَةُ الرَّحمنِ غايَةُ حُبِّهِ مَعَ ذُلِّ عابِدِهِ هُما قُطبانِ

ئێمە کە پەروەردگارمان ناسیو بەگەورەییو دەسەڵاتی بێ سنووری ئاشنابووین، دەبێت ملکەچی ئەو پەروەردگارە بین! نێوچەوانی بەندایەتی بخەینە سەر زەوی، ملکەچیو بە تەواوی خۆشەویستیو ئەوینو تەواوی تەسلیمەوە پەیمانی عبودیەت لەگەڵ خوداوەندا ببەستین...

ئەو کات جگە لە (الله) مەعبودو مەئلوهو خودایەك ناناسین.

﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ هود: ١٢٣

ئیدی دوعاو نزاو تکاو ڕەجاو پاڕانەوەو لالانەوەو، هیواو ئاواتو حەزو خۆزگەو، هەستو نەستو، سکاڵاو هاوارو حاجاتو ئاتاجمان تەنها لەو داوا دەکەین، چونکە دەزانین کەس بێ ویستی خودا، هیچی پێ ناکرێ لەم گەردوونەدا، ئەوانەی کە خەڵکی دەیانپەرستنو هاواریان لێ دەکەنو لێیان دەپاڕێنەوەو دڵیان پێوەی پەیوەستە، دەسەڵاتی

مینشیکیان نییە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ ﴾ الحج، ٧٣

له تاریفی تەوحیدی ربوبییەتدا گوتمان ئەم جۆرەی تەوحید زانایان بە کورتی وەها پێناسەی دەکەن (هُوَ تَوحِيدُ اللهِ في أفعاله) واتە: یەکتاپەرستی خوداوەند لە کارەکانیدا)، سەبارەت بە تەوحیدی ئولوهیەتیش دەڵێن: (هُوَ تَوحِيدُ اللهِ في أفعالِنا).

پێچەوانــە بــە ئەو ئەمیان یەکتاپەرســتی خــودای گەورەیە لەو کارانەدا کــە ئێمە ئەنجامی دەدەین! واتە هەرچی کارێك کە دەیکەین تەنهــا بۆ ئــەوی ئەنجام دەدەیــنو، لە پێناوی ئــەو خودایە مەزنەدا دەیکەین!

جــا ئەو کارانە کاری لاشــە بن، یا دڵ! نوێــژو نزاو پاڕانەوەو کارو کرداری زاهیربن، یا خۆشەویســتیو ترسو تەقواو خەشیەو تەسلیمو تەوەککول کە کارو کرداری دڵو نێوەڕۆکی موسوڵمانن!!

بەڵگەکانــی خودایەتــی خوداوەندو یەکتایی لــە ئولوهیەتدا، بێ شــومارن، خوداوەند خۆی لە قوئانی پیرۆزدا زۆر بە ســانایی بۆمان ڕوون دەکاتەوە:

﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون، ٩١

خوداوەنــد نــەوەی نینو هیــچ خودایەکــی لەگەڵ نییــە، ئەگەر

خودایەکی دی لەگەڵ خودایا هەبا، ئەوا هەر کەســەو دەســتی بەسەر مەخلوقاتی خۆیدا دەگرتو هەوڵی دەستبەسەراگرتنی موڵکی یەکدییان دەداو بەم کارەش، سیستەمی گەردون لێك دەترازاو دونیا وێران دەبوو.

پاکیو بێگەردی بۆ خودا لە وەسفی موشریکان!

یاخود دەفەرموێ: ﴿قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ٤٢﴾ الإسراء: ٤٢

ئەگــەر لەگەڵ خــودادا خودایانی دی هەبان، ئــەوا هەموو هەوڵی زاڵبوونو ســەرکەوتنیان بەســەر خاوەنی عەرشــدا دەداو دەیانویست خۆیان خاوەن عەرشو دەسەڵات بن!

ئەوکات کەونو گەردون دەبووە مەیدانی ململانێی خوداکان!

وەلێ جگە لە (الله) خاوەنی عەرشو دەســەڵاتو مەلیکولمولوك، خودایەکــی دی نییــە.. ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ١١٦﴾ المؤمنون: ١١٦

کەواتە با دڵەکانمان جگە لەو خودایە، ڕوگەیەکی دی نەناســێو لە دەســتی دەســەڵاتی ئەووە نەبێت، چاوەڕوانی هیچ کەرەمو خەڵاتێك نەکات.

ئــەو خــودا گەورەیەش بەســە، بۆ کەســێك کە بــە تەواوی ئیتمینانەوە پشتی پێ بەستووەو، ڕووی نازو نیازی گرتۆتە ئەو!

بەندەیەك خامە بکاتە باوەشی قامکە چکۆلەکانیو بیەوێ سەبارەت بە حەمدوسەناو وەسفی خودایەك بنووسێ کە خاوەنی ناوی زێدەجوانو سیفاتی بێ سنوور بەرز بێت، زۆر ئەستەمو دژوارە...

ڕەحمەتی خودا لە موتەنەبی شاعیر کە دەفەرموێت:

وأمّـــا وحَـــقِّـــكَ وهْـــوَ غـــايَـــةُ مُـقْـسِـم
لَـلْـحَـقُّ أنـــتَ ومـــا سِـــواكَ الـبـاطِـلُ
مـا دارَ في الـحَـنَـكِ الـلّـسـانُ وقَـلَّـبَـتْ
قَـلَـمـاً بـأحْـسَـنَ مِـنْ ثَـنَـاكَ أنَـامِـلُ

ستایشی خواوەند، باسکردنی پەروەردگاری مەزنو هەڵبژاردنی وتەگەلێك بۆ وەسفی عەللامولغیوب بە من چۆن دەکرێت!؟

سوێند بە زاتی خودا ئەو کاتەی دەمەوێت وەها کارێك بکەم، بەرامبەر بە ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ تەزوو بە ڕۆحمدا دێتو زمانم لاڵ دەبێت، خۆئەگەر خودای گەورە هیچ وەسفێکی دیکەی زاتی شەریفی خۆی نەکردباو تەنها فەرموویای ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ بەس بوو بۆ کەسێك بزانێت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ مانای چییە!

ئەو کاتەش دەچێتە خزمەت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ الحشر: ٢٢ بۆ گەورەیی مەلیکولملوك بۆ ڕاگری ئاسمانو ڕاخەری زەوی، بۆ بەدیهێنەری بوونەوەر، بۆ شای دونیاو ئاخیرەت، بۆ ڕۆزیدەری هەموو مەخلوقات!!

بەرامبەر میهرو بەخشندەییو گەورەییو، دەسەڵاتی بێسنووری من چی بڵێم!؟

بۆ خودایەك کە جگە لە ئەو، ئیدی خودایەك نییە شایانی پەرستن بێتو، دەبێت بە چی زمانێ سەنای ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای بکەین!؟

خودایەك كە جوانو جوانویستو نێوەكانیشی لەوپەڕی جوانیدابن، چی بڵێین لە وەسفیدا!؟

خودایەك كە لە بەرزی سیفاتو بڵندی مەقامو مەكانو هێزو دەسەڵاتو عیلمو توانای كەسی نەگاتێ!

بە چی وەسفێك وەسفی بكەین! ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین، تەنها دەتوانین لە ڕێگای وەسفی خوداوەند خۆی لە قورئانداو پێغەمبەریش لە فەرموودە شەریفەكانیدا وەسفی بكەینو خودای گەورە بە هەموو ئەو وەسفانە وەسف بكەین كە لە قورئاندا وەسفی خۆی پێ كردوون، یاخود پەیامبەر (سڵاوی خودای لێبێت) لە فەرموودەكانیدا وەسفی پێ كردوون!

چونكە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ گەیشتن بە خوداو وەسفی زاتی ئیلاهی، جگە لە وەحی خودایی كە ئەویش قورئانو سوننەتە!

ئێمە دەبێت دوای سەلماندنی تەوحیدی ڕبوبییەتو ئولوهییەت، ئیقراری تەوحیدی ئەسماءو سیفات بكەیت، بەو شێوەیەی كە خودای گەورە وەسف كراوە لە قورئانو سوننەتی سەحیحدا!

بێئەوەی پرسیار لە كەیفییەت بكەین، یا تەمسیلی بكەینو بە شتێكی بشوبهێنین، یا تەئویلی بكەینو تەحریفی ماناكانی بكەین!

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشورى/ ١١

ئازیزم ئەمە ئەو ئایەتەیە كە بۆ یەكەمین جار زمانم پێی پژا، یەكەمین ئایەتی قورئانە كە باوكم فێری كردمو لەو ڕۆژەوە هەم خۆشەویستی قورئانو هەم خۆشەویستی ئەسماو سیفاتی خودا لە نێو دڵمدا چەسپا!

ئەوکات مانای ئەم ئایەتەم نەدەزانی، تەنها بە هەستی پاکی منداڵانەو فیترەتی خوداییەوە دووبارەم دەکردەوە تا لە بەرم کرد، ئەو کات تازە پێم گرتبوو، یەك دوو ساڵان بووم هێشتا زمانی گفتوگۆم تەواو پاك نەبووبۆوە، وەلێ دواتر هەموو تەمەنم بەخشی بە فێربوون‌و تێگەیشتن لە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام‌و ئاشنابوون بە ناوو سیفاتی ئیلاهی!

هێشتا هەر وا دەزانم منداڵە چکۆلانەکەی دوێنێم‌و تازە بۆ یەکەم جار ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنمەوە!

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشوری/ ١١

ئاخر بەرامبەر خودایەك کە هیچ نموونەو هاوشێوەیەکی نییەو بیسەرو بینەری ڕەهایە، من چیم‌و چی دەزانم‌و دەتوانم چی بڵێم؟!

لە یەکی ناوەندیش بووم، کاتێك لە ژوورەکەمدا بە خەتی فارسی لە سەرسەری خۆمەوە ئایەتی: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ طه/ ٥ هەڵواسیبوو!!!

مەلایەك کە ئەوەی بینی گوتی: لەم هەموو ئایەتە بۆچی ئەم ئایەتەت هەڵواسیوە، دەزانی چی هەراو بەزم‌و کێشەیەکی لە سەرە!!

من ئەو کات هیچم لە جیاوازی‌و ململانێی پێڕو فیرەقە کەلامییەکان نەدەزانی‌و، نەمدەزانی کە ئەوان سەبارەت بە عەرش‌و عولووی خودا چەندە ناکۆك‌و ناتەبان! بەڵام لە ناخی دڵمەوە باوەڕم بە بەرزی‌و بڵندی‌و ئیستیوای خوداوەند هەبوو، ئێستاش کە پسپۆڕی عەقیدەو فیرەقی ئیسلامیم هەر هەمان

بـــاوەڕی جارانم هەیەو، دڵنیام گرتنەبـــەری تەئویلو تەحریف جگە لە سەرلێشێوانو مەحرووم بوون لە چێژو حەلاوەتی ئیمان بە ئەســـماءو ســـیفاتو ئاشـــنانەبوون بە گەورەییو عەزەمەتی خودایی هیچی دی نییە! ﴿ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾ المؤمنون/ ١١٦

خودا زۆر لەوە گەورەترە کە زاتو ئەسماءو سیفاتی بچێتە ژێر ڕکێفی عەقڵی بچووکی ئەهلی کەلام!

جا هەر کەسێك دەیەوێت بە ڕاستو درووستیو زۆر بە سانایيو بەبێ گرێ لەگەڵ ئەسماءو سیفاتی خودادا بژیو لە ژیاندا شوێنەوارەکانی ببینێ، ڕاستەوخۆ تەماشای قورئان بکات، یا ڕاستەوخۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (سڵاوی خودای لێبێت) لە سەحیحەیندا بخوێنێتەوە، بە تایبەت کتێبی (التوحید)ی سەحیحی ئیمامی بوخاری!

هەموو ئـەو پـەڕاوانـەش کە ئەهلی سوننەتو جەماعەت نووسیویانن لە تەوحیدی ئەسماءو سیفاتدا، تەنها لەو دوو سەرچاوەیە وەرگیـراون، لەوێشدا بـاوەڕدار گەورەییو تواناو دەسەڵاتو کەماڵو جەلالو جەمالی خودا، دڵو دەروونی داگیر دەکاتو، لەگەڵ بیستنی ناوو سیفاتی خوداوەند، وەك بێی ناو ئاو دەلەرزێ، بەرامبەر بە گەورەیی ئەو خودایە ئیدی چاوی گەورەیەکی دی نابینێ!

وإنِّي لَتَعْرُوني لِذِكْرِاكَ رِعْـدَةٌ     كما انْتَفَضَ العُصْفُورُ بَلَّلَهُ القَطْرُ

دیمەنێکی هەستبزوێن بوو، ئاوری لە ناخم بەردا، فرمێسکەکان هێدی هێدی، بەسەر ڕوومەتە چرچولۆچەکەیدا دەهاتنەخوار، بە کوڵ دەگریا، دەیگوت: تەنها چاوەڕێم لە ڕۆژی دواییدا، تۆڵەم بۆ بکاتەوە!

لە ماڵێکی گڵیندا، کە زێتر لە گۆڕ دەچوو، وەك لە ماڵ، جگە لە چەند پارچە پەڕۆیەکی شڕو پێخەفو ڕاخەرێکی کۆن، هیچت بەدی نەدەکرد، پیرەمێردو پیرەژنێکی پیرو کەنەفت، پیرەژنەکەش نەخۆش بە ئیفلیجی مێشك، لە جێدا کەوتبوو، پیاوەکە هەموو ئەرکێکی ماڵی گرتبووە ئەستۆ، وێڕای پاكوخاوێنیو خزمەتی خێزانە نەخۆشەکەی!

لە ئاویلکەی ژیانو دواساتەکانی کولەمەرگیدا، لەبری حەسانەوەو خزمەتو جێگای گەرمونەرمو چاودێری، لە هەموو نازونیعمەتێکی دونیا بێبەشبوون.. وەلێ، بە دڵێکی پڕ لە ئیمانەوە، داوایان لە خودای گەورە دەکرد، لە قیامەتدا تۆڵەیان بۆ بکاتەوە!

بەرامبەر بەو یەقینو ئیمانو متمانەیە، تەزوو بە ڕۆحمدا هات!

ئەمە دیمەنێکی کورتی خێزانێکی هەژار بوو، لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا!

لەوێڕا زانیم، یەقینو متمانە بە خوداو باوەڕ بە ڕۆژی دوایی، تەنها بە خوێندنەوەی کتێبو وەرگرتنی بڕوانامەی بەرز، دەست ناکەوێت!

چونکە ڕۆژانە، کەسانێکی زۆر دەبینین، دینو زانستی خۆیان، لە بازاڕی ئەم دونیا فانییەدا، دەخەنە سەر سەوداو بە نرخێکی کەم دەیفرۆشن!

وەکو پێغەمبەری ئازیز «سەلامی خوای لێبێت» دەفەرموێت: (يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنيا).

«بیرو باوەڕو دینەکەی، بە شتومەکێکی کەمی ئەم دونیایە دەفرۆشێ»، خۆ هەژارو موحتاج نییە، بەڵام دینەکەی لا هەرزانە، نرخی نازانێ، یەقینی بە وادەو بەڵێنی خودایی نییە، کە لە بەهەشتدا، چیی بۆ باوەڕداران داناوە، لە خۆڕا باقی دەدۆڕێنێ بە فانی!

خۆشەویستی خوداو تاسەی لیقای خوداوەندو ڕۆژی مەزید، دڵی داگیر نەکردووە!

نازانێ پەنابردن بۆ خودا، چەندە گەورەیە!

دیسان ئازیزم، دیمەنی ئەو مامە پیرەیە، هاتەوە بەردیدەم، لە کوڵی گریانو گەرمەشینی لە دەست سەختیی ژیان، تەنها چاوی بەفرمێسکی بڕییە ئاسمانو دەیگوت: تەنها داوا لە خودا دەکەم، لە قیامەتدا تۆڵەم بۆ بکاتەوە!

ئەم وشانە سادەن، بەڵام بە هەموو زارێکدا نایەنو هەموو کەسێك ناتوانێ، وشە گەلێکی وەها بدرکێنێ!

ئەم پیرەمێردە، مەلای دوانزەعیلمو پرۆفیسۆری زانکۆ نییە! وەلێ، زانایە بە خودا.. کە ئەویش لوتکەی زانستە!

دەزانێ، کە دونیا، خانەی سەفەرە، نەك لانەی نیشتەجێبوونو مانەوەی ئەبەدی.. لەوێدا، ئیدی گۆچانی سەفەر دادەنێو لە کۆشکی شاهانەی خوداییدا، کۆتایی بە هەموو نارەحەتییەکانی ژین دێنێ..لەوێدا، کە یەکجار نوقمی بەهەشتی دەکەن، ئەگەر داماوترینو لێقەوماوترینی دونیا بێت، دەڵێت: «وَعِزَّتِكَ وَجَلالِكَ مارَأَيتُ بُؤساً قَطُّ» سوێند بە عیززەتو جەلالت هەرگیز نارەحەتیو بێنەواییم نەدیوە!!

ئیدی ئەمە زانینی ڕاستەقینەیە!! ئەم ماریفەتی تەواوو سلوکی عاریفانی حەقیقییە!

هەر بۆیە بە ئیمامی ئەحمەدیان گوت: مەعرووفی کەرخی زۆر زانا نییە! ئەویش لەوەلامدا گوتی: مەعرووف عیلمی خەشیەتی لە لایە، کە ئێمە هەموومان بە دەوری ئەو عیلمەدا دەسووڕێینەوە!!

فوزەیلی کوڕی عەیاز، بە هاروونە ڕەشیدی گوت: **تۆ لە من زاهیدتری، چونکە من زاهیدم لە دونیایەك، کە فانییە.. بەلام تۆ زاهیدی لە ئاخیرەتێك، کە باقییە!**

ئازیزم: بیرکردنەوە لە نزمی دونیاو پووچیو بێنرخیی مەتاعی ئەم دونیا فانییە، بۆتە خەیاڵ! باوەشکردنمان بەم دنیایەداو پێشبڕکێ بۆ کەڵەکەکردنی ماڵو سامانێك، کە هەموومان دەزانین بۆ میراتگرانی کۆدەکەینەوە، هێندە خەیاڵو مێشکی داگیر کردووین، قیامەتمان بە شێوەیەك فەرامۆش کردووە، وەکو مەحوی دەڵێت:

**خەیاڵی پووچی دونیا، وەها دەماغو دڵمی پێچاوە**
**قیامەت، مەگەر هەر ڕۆژی قیامەت، بێتەوە فکرم!**

زوهدو قەناعەت، تەقواو وەرەعو ترس لە خودا ماڵاوایی لە هەواری دڵمان کردووە!

جونەیدی بەغدادی پێمان دەڵێت: زوهدو پشتکردن لە دونیا، بریتیە لە: بەچکۆلە دانانی دونیاو سڕینەوەی شوێنەواری لە دڵدا!!

ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت: زوهد، وازهێنانە لە هەموو شتێك، کە لە خودات دوور دەخاتەوە!

ئیبنولقەییمیش دەڵێت: هەموو عاریفان لەسەر ئەوە کۆکن، کە زوهد سەفەری دڵە؛ لە داری دونیاو، وەرگرتنی مەنزڵێکە، لە مەنزڵەکانی ئاخیرەت!

کوا ئەو دڵانەی شەوانە، لە دەوری عەرشی خوداو ڕۆژانە لەسەر فەرشی بەهەشت، وەکو پەروانەی دەوری چرا، دەسووڕێنەوە؟

ئیبنو سەمماك دەڵێت: لای زاهید ئیقبالو ئیدباری دونیا چوونیەکە! زیاد بکا، یان کەم، جیاوازی نییە!

ئیمامی زوهری دەفەرموێت: زاهید ئەو کەسەیە، حەرام بەسەر سەبرگرتنیدا زاڵ نابیو حەڵاڵیش سوپاسو شوکری خودای بیر ناباتەوە!

سوفیانی ئەوری دەڵێت: زوهد لە دونیا، بە خواردنی زبرو جلوبەرگی شڕ نییە، بەڵکو بە هیوابڕانە لە دونیا!!

لە دونیایەك وەکو پێغەمبەر «دروودی خودای لێ بێت» دەفەرموێت: کە ئەگەر لای خوداوەند، هێندەی باڵەمێشوولەیەك ڕێزی هەبا، قومێك ئاوی لێ نەدەدا بە کافر.

وەلێ، زۆر لەوە بێبایەخترە!!

بە داخەوە ئێمەش بە دوایدا ڕادەکەین! لە پێناویدا هەموو شتێك دەکەینە قوربانی! هەندێجار دینەکەشمان!!

بەڵام باوریا بین، پەیامبەری ئازیز دەفەرموێت: «وێڕای نزیکبوونەوەی قیامەت، تا دێت خەڵکی زێتر باوەش بە دونیادا دەکەنو زێتر لە خودا دوور دەکەونەوە».

بـــۆ زانینی ڕازو نهێنیی زوهد، له حهســـهنی بهســـری دهپرســـین، دهڵێیـــن: نهێنیـــی زوهدی تۆ چییه له دنیادا، ئـــهی ئیمام؟ له وهڵامدا گوتی چوار شت:

یهکـــهم: زانیم، که ڕزقێك خودا بۆ منی دانابێ، کهس نایبات، ههر بۆیه دڵم موتمهئین بوو.

دووهم: زانیم، که ئهو کارهی لهسهرمه، ئهنجامی بدهم کهسێکی دی بۆم ئهنجام نادا، ههر بۆیه خۆم خهریکی بووم!

ســـێیهم: زانیم، که خودا ئاگادارو چاودێره بهســـهرمهوه، ههر بۆیه شهرمم کرد، بمبینێ له مهعسیهتدا!

چوارهم: زانیم، که مردن حهققه، ههر بۆیه توێشـــووم بۆ سهفهری دیداری خودایی ئامادهکرد.

هیچ هەلتوانێ، برینەکان سارێژ ناکات، هیچ دەرمانێك پشو نادات بە ڕۆح، جگە لە متمانە بە خوداو خۆ هاویشتنە نێو دەریای میهرو سۆزی خودایی!

ئەو کاتەی پرپاسکەی هەموو کاروبارەکان تەسلیم بە خودا دەکەی، ئیدی دڵنیایی‌و ئارامی، دەبنە هەمیشەمیوانی دڵت!

ئەو کاتەی کارەکانت دەسپێری بە خودا، ئیدی پرگەرووت هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەمژی! ئیدی لە سێبەری ﴿ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴾دا!

تا زێتریش دڵ پەیوەستی خودا بێ‌و بە ڕاستی بەندەیەکی ملکەچ بێ، خودا زێتر یارمەتی‌و پشتگیری خۆی بۆ بەندەکەی دەکاتە خەڵات!

سەرکەوتنیش بەسەر ئازارو کۆسپ‌و نارەحەتییەکانی ژیاندا، بە پێی دەستگرتنی بەندەیە بەهێزو دەسەڵاتی خوداوە!

کاکڵەی بەندایەتیش، ڕووکردنە خودایە بە تەواوی دڵ‌و وەرگێڕانی ڕووە لە هەموو ڕووگەیەك، جگە لە ڕووگەی ئیلاهی!

ئیدی شتێك نییە؛ چاوەڕوانی بکەی جگە لە خودا!

متمانە بە هیچ ناکەی جگە لە خودا، تەنانەت کردەوە باشەکانی خۆشت!!

دەبێت هێندە لە دەریای میهرو سۆزی خوداوەند دڵنیابی، کە بزانی بەخشینی ئەو بێسنوورەو کەریمی عەتابەخش تەنها خۆیەتی!

ئازیزم، مانایەکی زۆر ورد هەیە، کە من پێشتر درکم پێ نەکردبوو، نەمدەزانی، کە ئەوە پێچەوانەیە بە متمانەی کوللی بە خوداو پشتبەستنە بە کردەوەی چاك!!

عاریفان دەڵێن: ئەگەر لە کاتی گوناهو تاواندا، ڕەجاو ئومێدت بە خودا لاواز بوو، ئەوە دیارە تۆ بە ئیعتماد لە سەر کردەوە چاکەکانی خۆت، داوای یارمەتیو کۆمەك لە خودا دەکەی!!

نا، ئازیزم نا....

خۆ کاتێ ئێمە گوناه دەکەینو یاخی دەبین لە خوداوەندو دەبینە بەندەیەکی خراپو دوور لە خودا! خوداوەند هەر خوداو پەروەردگاری ئێمەیەو لێمان دوورناکەوێتەوە، ئەوکاتە دەرگای تۆبەو بەزەییو میهری خۆی خستۆتە سەر پشتو داڵانی مەغفیرەتی والا کردووە بۆمان!

هەرچەندە ئێمە شەرمەندەو خەجاڵەتین، بەڵام ئەو زاتە گەورەیە، لێبوردەو بەخشندەیە!

کەواتە: هەرگیز وەها بیرنەکەیتەوە، کاتی نزاو پاڕانەوە، کە خودا نزای منی گوناهبار وەرناگرێ، تەنها ئەو کاتانە چاوەڕێی کۆمەکی ئیلاهی نەبی، کە لات وایە پیاوی چاکی!

ئێمە هەرچەندە چاکبین، بە چاکەی خۆمان، ناگەین بە لوتفی بێسنووری ئیلاهی!

کەی کرداری خواروخێچی ئێمە، دراوی مامەڵەی فەیزی ئیلاهییە!!

بە چیمانەوە سەودای نووسەرەتی خودایی‌و یارمەتیو دەسگیرۆیی ئیلاهی بکەین!؟

مەگەر تەنها ئەو کاتەی، کە هەنیسكو قوڵپی گریان گەروومان دەتاسێنن‌و فرمێسکی پەشیمانی، ڕووی سیامان تەڕ دەکاتو دەستی

دوعاو نزاو پاڕانەوەمان دەلەرزێ، چاوەڕوانی لوتفی خودا بکەین!

بەڵکو بە بەخشندەیی خۆی، عەفومان بێ عەتاکا!

گریەی بەکوڵ، بەدڵ، لە خەرافاتی خۆخەجڵ

ناڵەی دڵی شەوانو هەناسەی سەحەرگەهان

هەر ئەو هەناسەیە، کە بدا فێنکی بە دڵ

بەو تاقە ناڵەیە، کە بگا گەرمیێ بە گیان «مەحوی»

ئێمە داوا لە کەسێك دەکەین، کە خۆی دەفەرموێ: داوام لێ بکەن! بەڵێنیشی داوە، کە وەڵامان بداتەوە! لێمان نزیکە، بیسەرو بینەری کردارو گوفتارمانە ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾ سبأ: ٥٠

هەربۆیە شاعیر دەڵێ:

وَإِنِّي لَأَرْجُو اللهَ حَتَّى كَأَنَّنِي

أَرَى بِجَمِيلِ الظَّنِّ مَا اللهُ صَانِعُ

کە ئەمەش، بە ڕاستی جوانترین گومانو گەورەترین ئومێدە بە خودا، کە بە شێوەیەك ڕەجاو ئومێدی بە خودا هەیە، وەکو ئەوەی بە گومانی باشی بە خودا، بە چاوی خۆی ببینێ؛ چۆن خودا کارەکەی بۆ ئەنجام دەدا!!

کەواتە: ئەو کاتەی لەشکری خەم، هێرشت بۆ دێننو ئادەمیزادەکان ئازارت دەدەنو مەترسیو ناڕەحەتی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆت دەدەن، سەرێك هەڵبڕە بۆ ئاسۆو چاوەڕوانی لەشکری خودایەك بە، کە تەنها خۆی نەبێ، کەس ژمارەی سەربازەکانی نازانێ؛ ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ المدثر: ٣١

بە نووری ئیمان، هەوری ڕەشی خەمەکانت بڕەوێنەوەو بزانە



کە: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ التكوير، ٢٩

ئەوسا دەزانی؛ کە دەوروبەر، هیچیان پێ ناکرێ، جگە لە کارێك، کە خودا دەیەوێت؛ ئەوەی دەیکەن، تەنها جێبەجێکردنی کارێکە، کە دەبوا ببێو قەدەری خودای لەسەرە، هەروەکو چۆن براکانی یوسف -دروودی خودای لێ بێ- ویستیان بیکوژن، بەڵام نەمرد!

ویستیان شوێنەواری بسڕنەوە، بەڵام پلەو پایەی زۆر بەرزتر بووەوە!

پاشان فرۆشرا؛ بۆئەوەی بیکەنە کۆیلە، بەڵام خودا کردی بە پاشا! ویستیان خۆشەویستییەکەی لە دڵی باوکیدا بسڕنەوە، بەڵام زۆر لە جاران زێتر بوو!

کەواتە: هەرگیز نیگەران مەبە؛ لە پلانی ئادەمیزادەکان، ویستی خودا لە سەرووی ویستی هەموویانەوەیە، خودایەك کە هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێ ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ﴾ الفرقان، ٥٨

ئیمامی عەلی «ڕەزای خودای لێبێت» دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە، پشت بە خودا ببەستن، متمانەتان بەو هەبێ؛ چونکە بۆ هەموو شتێ، خوداتان بەسە!

ئیبنولقەیم دەفەرموێ: تەوەکول‌و پشتبەستن بە خودا، کۆکەرەوەی عیلم‌و عەمەلی دڵە؛ چونکە عیلمی دڵ، بریتییە لە: یەقین بەوەی، کە خودا بەسە، بۆ هەموو کارێ، کە وەکیل بێ، وێڕای یەقین بەوەی کە ئەو وەکیلە، کە خودایە بە باشترین شێوە ئەو کارە ئەنجام دەدا، کە پێی سپێرراوە، هاوکات دەبێت باوەڕی وەهابێت، کە کەسی دی، ناتوانێ

وەکو ئەو، ئەو کارە بکا، ئەمەش تەسدیقی ﴿ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾یە. یەقینە بە ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾ الزمر: ٣٦

عەمەلی دڵیش، سوکنایی هاتنە بەو وەکیلە، دڵنیابوونە بە تەواوی ئیتمینانەوە لێی!

سپاردنو تەسلیمکردنی هەموو کارەکانە بەو، ڕازیبوونە بە تەسەروفی خوداوەند، زێتر لە ڕازیبوونی لە تەسەڕووفی خۆی!

لوقمانـــی حەکیم بە کوڕەکەی گوت: **کوڕم، دونیا دەریایەکە، خەڵکیکی زۆری تێدا نوقم بووە، ئەگەر توانیت با کەشـــتییەکەت لــەم دەریایەدا، باوەڕ بە خوداو بارەکەی، کارکردن بە فەرمانی خوداو، چارۆکەکەی، پشتبەستن بە خودا بێ، بەڵکو ڕزگارت بێ!**

حەســـەنی بەســـری دەفەرموێ: ئادەمیزاد، ئـــەوە لاوازی یەقینە، کە ئەوەنـــدەی متمانـــەت بەوە هەیە، کە لە نێو دەســـتی خۆتدایە ئەوەندە متمانەت بەوە نییە، کە لە دەستی خوادادایە.

کۆتایی نامەکەم ئازیزم بەم فەرموودە شیرینەی پێغەمبەری نازدار دێنم، کە دەفەرموێت: «يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ» رواه مسلم

چونکە وەکو باڵندە تەنها پشتیان بە خودا بەستووە، باڵندە بەیانیان بە سکی خاڵی، لە هێلانەکەی دێتەدەرو لە بیابانێکی وشکا، بۆ دەنکە گەنمـــێ دەگەڕێ، ئێوارە بە ســـکی تێرەوە دەگەڕێتـــەوە، ئەمە وێڕای ناسکی دڵی باڵندەو پاکی دڵو دەروونی، خودا دڵو دەروونی باڵندەمان پێ ببەخشێو لەو کۆمەڵە دڵپاکو پڕ تەوەککولە بین.

ئیلاهی لە شەوەزەنگی ئەم زەمەنە تاریكو ئەنگوستە چاوەدا، پەنام هێناوە بۆ تۆ، جگە لە نووری تۆ، ئیلاهی.. تروسکاییی‌یەك بەدی ناکەم!

کەسێك نییە جگە لە تۆ سکاڵای دڵمی لا بکەمو دەرمانی دەردی منی لابێ، جگە لە تۆ ئەی پەروەردگار، کێ هەیە لە دەرگای تۆی دابێو بۆی نەکرابێتەوە؟ کێ هەیە دەستی بۆ لای تۆ بڵند کردبێو نائومێدت کردبێ؟ کێ هەیە بە دڵی شکاوو فرمێسکی ڕژاوو هەنسکی بەکوڵەوە، کڕنووشی بردبێو بە بارانی میهری خۆت گوڵاو پرژێنی دڵیت نەکردبێ؟

کەس هەیە جگە لە تۆ؛ پەنای بێپەنایانو هیوای بێهیوایانو ڕەجای ئاواتەخوازان بێ!؟ ئیلاهی ئەگەر من بەندەیەکی یاخی بم، خۆ هەر لەسەر زەوییەکەی تۆو لە ژێر سێبەری ئاسمانەکەی تۆدامو لە ڕزقو ڕۆزی تۆ دەخۆم!

خودایە من هەرچەندە خراپ بم، تۆ هەر خودای بەخشندەو میهرەبانی، ببەخشە بەندەیەك، کە بە دەستی خاڵیو ڕووی سیاو باری تاوانەوە هاتۆتە دەخالەتت!

هەژارو داماوو کەساسەکان، کێیان هەیە جگە لە تۆی دەوڵەمەند؟ لاوازو بێدەسەڵاتەکان، کێیان هەیە جگە لە تۆی بەهێزو بە توانا؟

کێ هەیە جگە لە تۆ هاوارو هەنسکی لێقەوماوان ببیسێ، کێ ئاگای لە قرچەی جەرگو ناڵەی دڵو کسپەی دەروونە، جگە لە تۆ؟

ئەوەی داوای لێ دەکرێ، خۆ هەر داوا لە تۆ دەکا! ئەوەی دەستی لێ پان دەکرێتەوە، هەر دەست لە تۆ پان دەکاتەوە! ئەوەی لێی دەترسین

ناتوانێ لە تۆ نەترسێ!

ئەوەی وا دەزانین کاری مەی بەدەســتە، خۆ هەموو کاروباری وا لە دەستی تۆدان!!

ئەوەی ئێمە هیوامان پێیەتی، خۆ تەنها هیوای هەر بە تۆیە!

خودایە شەرمەزارین، لە بری بێینە بەر دەرگای والآت بە عیززەتەوە، بەرەو دەرگای بەندەکانت ڕادەکەین بە زیللەتەوە!!

کێ هەیە خۆی تەســلیمی تۆ کردبێ‌و تۆش تەسلیمی دوژمنەکانیت کردبێ!؟

کێ هەیە داوای ڕزق‌و ڕۆزی لە تۆ کردبێ‌و لەبرسا کوشتبێتت؟
ئەوەی بژی ڕزقی لەســەر تۆیەو ئــەوەی بمرێ دێتەوە بۆ لای تۆ، خوداوەند!

چەندت نیعمەت پێداین‌و نەمانتوانی شوکری بکەین!
چەندجار تاقیتکردینەوەو نەمانتوانی ئارام بگرین!!؟
چەندجار تاوانی ئێمەت بینی‌و داتپۆشین‌و ڕووڕەشت نەکردین؟!
ئێمە خراپەمان کردو تۆش هەرلەسەر چاکەی خۆت بەردەوامبووی لەگەڵمان!؟

خودایە کەسێك تۆ دەستی نەگری‌و هیدایەتی نەدەی، ڕێگەی چەندە ســەخت‌و تاریکە! کەســێ تۆ نەبیتە هۆگری دڵی، چەند نامۆو تەنیاو بێکەسە!؟

ئەی هەمیشە نزیك لە بەندەکانت، ئەی خۆشەویستی گوناهباران!
ئــەی ئاسودەبەخشــی دڵــی خوداویســتان، پەنای بێپەناو کەســی

بێکەسان، ئەی قبوڵبەخشی تۆبەکاران، ئەی لێبووردەی گوناهباران ئەی داپۆشەری عەیبوعار، خاوەنی لوتفی بێ شومار!

لــە بەرامبەر میهرەبانیت، تاوانی خۆمــان لا بچووکە! لە بەرامبەر چاکەی تۆدا خراپەی خۆمان لا چرووکە!

چەنــد شــەرمەزاری دەرگاتین، هــەزار ئەوەنــدە بەڵەمای لوتفو کەرەمو خەڵاتین!

یەحیــای کوڕی موعاز دەڵێ: «إلهي! كيفَ أدعُوكَ وَقَد عَصَيتُك، فَكَيفَ لا أدعُوكَ وَقَد عَرَفتُك!»

خودایە شــەرمەزارم! چۆن لە ڕوومبێ لێــت بپاڕێمەوە، لە کاتێکا سەرپێچی فەرمانی تۆم کردووە؟

بەڵام دوای ئەوەی بە تۆی بەخشندەو میهرەبان ئاشنا بوومو دەزانم چەند بە بەزەییت، چۆن لێت نەپاڕێمەوە!

ئازیــزم: هەموو لەزەتو خۆشــییەکانی دونیــا، مەتاعێکی کەمن، خۆشییەکی کاتین، جگە لە خۆشیو لەزەتی قوربی ئیلاهی!!

نزیکی لە خوداو هۆگربوون بە زیکری ئەوو پەیوەستبوونو پشتبەستن بە زاتی «الله»، لەزەتێکی سەرمەدیو خۆشییەکی نەبڕاوەو بەختەوەرییەکی بێسنوورە، ئەو هەنگاوانەی بۆلای خوداوەندت دەبەن، ئەگەر بەسەر دڕکو داڵو پشکۆی ئاگریشدا بێت، خۆشترین لەزەتی ڕۆحن!

ئەو کاتەی مرۆڤ دەزانێ بۆ کوێ هەنگاو دەنێو بۆ لای کێ دەچێ! ئیدی ســەختی ڕێگاو ناڕەحەتی ئەو ســەفەرە موقەدەسە، ناتوانن لەو خۆشیە مەحرومی بکەن!!

ئەی هاوار: شاهەنشـــای گەورە، مەلیکولمولوك، دەرگای کردۆتە ســەر پشت، بانگی بەندەکانی دەکا بە لوتفو مەرحەمەتی یا عبادی!!

بانگیان دەکا بۆ دەریای میهری بێســنووری خۆی، بۆ گەیشــتن بەو دەوڵەمەندەی هەموو دەوڵەمەندان موچەخۆری ئەون!

بەو دەســەڵاتدارەی هەموو دەســەڵاتداران خزمەتکاری ئەون! بەو توانایەی، کە هەموو توانادارا‌ن غوڵامی ئەون!!

گەیشــتن بە خودا؛ گەیشــتنە بــە دەڤەرێك، کــە تیایدا خۆزگەو ئاواتــەکان ســنووریان نییەو کەرەمو بەخشــندەیی‌و جــودی ئیلاهی هەرگیز کۆتایی نایات!

گەیشتن بە خودا، گەیشتنە بە خاوەنی هێزێك، کە هەموو مەلەکوت لەبەردەستیدا لە گەردیلەیەك بچوکترن، هێزێك بە کافونونێك هەموو گەردوونت بۆ ژێرو ژوور دەکات!

بەڵام کەی دەگەینە نێو دەڤەری ئەمانی ئیلاهی‌و دەســتمان دەگاتە حەبلی مەتینی کۆمەکی هێزی خوداوەند!

ئەو کاتەی چرپەی لێومان زیکری ئەوە، نیگای چاومان یادی ئەوە، ترپەی دڵمان فیکری ئەوە!

ڕازو نیازمان ویردی ئەوە! ژیان‌و مانمان وەقفی ئەوە، هەنگاو تەنها بۆلای ئەوە!

خۆ بۆ ئەو دەرازێنینەوە، تەنها لەو دەپارێینەوە! نمایشمان هەر بۆ ئــەوە، ئەم دنیایەمان لا خەوە، گەر قوربی خوداما‌ن هەبێ، ئیدی چی دەبــێ، با ببێ، دڵ جێگای ئەوینــی خوایە، ترس‌و حوببی وی تێدایە،

ترسو لەرزی لە کەس نییە، خەیاڵی لای بەندە نییە، کێ دەس دەخاتە کاری خوا، دەتوانێ بەخودا بڵێ نا!؟

ئەوەی بە ڕاست خوای ناسیبێ، بە چاوی دڵ ئەوی دیبێ، متمانەی بە هێزی خوا بێ، ترسی خوا، لە دڵیا ڕوابێ! مەحاڵە لە کەس بترسێ، بۆ هیچ کار لە کەس بپرسێ!

کەسێ دەرگای خودای دیبێ، لە دەرگای کەسی دی دەدا!؟

کەسێ خودای خۆی ناسیبێ، خۆی بۆ هیچ کەس زەلیل دەکا؟ کەسێ خودا خۆی بانگی کا، ڕوو لە ڕووگەی هیچ کەس دەکا!؟ مەحاڵە دوای ناسینی خوا، حیساب بۆ بەندە قەت بکا!!

ئازیزی من، دەگێڕنەوە کابرایەك دەیویست لە ڕووبارێك بپەڕێتەوە نەیدەوێـــرا، لـــەو کاتەدا عابدێکـــی خواناس لەســـەر پارچە کاغەزێك شتێکی نووسی‌و کردیە نێو باخەڵی کابراو پێی گوت: مەترسە، باوەڕت بـــە خودای گەورە، یارمەتیـــت دەدا بۆ پەڕینەوە، بەڵام وریابە! ئەگەر باوەڕت بە خودا لە دەســـتدا، دەخنکێـــی! کابراش متمانەی پێکردو لە نێـــو ڕووبارەکـــەدا زۆر بە ئاســـانی هەنگاوی دەناو نزیـــك بوو لەوەی تەواو بپەڕێتـــەوە، بەڵام زۆری حەزدەکرد بزانـــێ لە نێو کاغەزەکەدا چی نووســـراوە! کاتێك کاغەزەکەی کردەوە بینی نووســـراوە «خودایە، یارمەتـــی ئەم پیاوە بدە؛ بۆئـــەوەی لەم ڕووبـــارە بپەڕێتەوە»، کابرا گوتی: هەر ئەمە بوو، جا ئەمە چییە! ئەم خودایە چۆن یارمەتی من دەدا!؟ لەو کاتەدا، کە گومان گەیشتە نێو دڵی، بەلادا هاتو کەوتە نێو ئاوەکەو نوقم بوو!! تا نامەیەکی دی بە خودای گەورەت دەسپێرم.

